ژمارەی سپاردن لەکتێبخانەی نیشتمانی هەرێم ٢٠٢ لە ساڵی ١٩٩٧
پیتچنین ودەرهێنانی هونەری نووسینگەی ئەپلس
چاپخانەی : هەولێر اوفسیت کریستال ٢٢٤٦٠
تیراژ : ١٠٠٠ دانە
چاپی یەکەم



پێشکەش

# بەدوای جوان و شۆخ و شەنگ



- بەیانی زوو بەدوای شۆخو (هەڵکەوتی) بەدبەخت بەدزی میریەوە سواری لۆریەکی گەورە بوونو ماڵئاوایی لە کەسوکارو منالانی کرد، بەرەو چارەسەری نەخۆشیەکی وێڵو سەرگەردان بەرەو تاران و هەندەران کەوتە رێگای هاتو نەهات.. وێستگەی حەسانەوەی لە شاری (شام) بوو.. بەدوای پڕ ئازار نەیزانی نەخۆشی (دوابراویەتی) هەر بۆیە نامەیەکی پڕ غەمی بۆ دایکی نووسیو زانی بەرەو دنیای سەرمەدی دەڕواتو ناگەڕێتەوە، ئاگرێکی بێ خۆڵەمێشی بۆ ئێمە جێهێشتو هەر لەغەمو یادگاریەکانیدا دەسوتێین و دەژین.

- شیرینەکەم.. ئێستاش پاش تێپەڕ بوونو هەڵوەرینی گوڵی تەمەنت لە یادمە نامەیەکت نووسیو لە نامەکەتدا لەدایەگیان دەپاڕێیتەوەو دەڵێی:- دایەگیان ئەگەرچی ئەرکو عەزابە لەپاڵ دوو کوڕەکەم (رەزو رەوەز) با رێبازی ساڵەوەختێنەش کەلای خەسوومە بگرنە خۆ.. ئەوانە دیاری و یادگاریمە با پێکەوە گەورە و پەروەردەو دڵیان لای یەک بێ.. توخوا دایە وەسیەت بێ ئەگەر نەتان بینیمەوە جلی رەشم بۆ مەکەن، با جەژنی لەدایک بوونی منالانم

هەموو ساڵێک بۆیان بکەن.. توخوا دایە گیان لەجیاتی من منالآن بگەڕێن با بێدایکیان پێوە دیار نەبێ.. ئۆف دایەگیان چۆن بەجێم هێشتن... خۆزگە زووتر بەحاڵی خۆم بزانیایە.. قەت بەجێم نەئەهێشتنو لە باوەشی ئێوەدا تێر تێر دەمرۆانیە چاوەکانتانو فرمێسکەکانتانو ئەو کاتە ماڵئاوایی یەکجارەکیم لێ دەکردنو لەخاکی خۆمو لەشاری خۆم دەبووم... ئێستا زانیم بۆچی بەکوڵ بۆم دەگریان... ئێوە لەدڵتانا شتێکتان لەمن حەشار دابوو.. جا دایە خێر نەدیوەکەم با پرسەکەم گەرمو گوڕ بێ، ئای چەند حەزم لە میوانو دەعوەت کاری بوو..

ـ ئۆف بەداو گیان بۆ لێم وونی.. چەندین ساڵە بەدوای گۆڕو یادگاریەکانتا دەچمەوە، لەیەکەم یاری سەردەمی منالێمو هەرزەکاریم دەپێچمەوە تۆم لەگەڵ بووی.. پێکەوە بووک بووکێنمان دەکرد، حەماموکێو چاوشارکێ، شەوانە بێ جیاوازی کوڕانو کچانی گەڕەکی چوارباغ یاری پەت پەتێن و کڵاوێنەو شەڕە گەڕەکمان دەکرد. کە گەورە بووین چووینە قوتابخانە.. جلو بەرگمان وەک یەک بوو.. ئەی کلۆڵی بەدبەختێ لە قوتابخانە کە لەیەک دەرسا دەرنەچوویووی پێکەوە وەک باران فرمێسکمان دەباران.. نەمزانی هەر لە منالیەوە فرمێسکو خەم دەبێتە هاوڕێی ژیانو تەمەنت.. ئای خوشکە خێر نەدیوەکەم.. یادگاریەکانت کێوێکی خەمە.. تەمە.. چەندە پاچو قولنگی لێ دەدەم هیوایەک بەدی ناکەم، کەیەسەر خۆما دێمەوە هەموو شتێک لەبەر چاوم گریانو تەمە.

خوشکە لێتۆراوەکەم: ئاخۆ ئێستە لە باوەشی چ خاکێکی پیرۆزدا لە چ گۆڕستانی دەوڵەتێکدا بی.. چارەنووست وای پێ کرد قورئان ووتەنی نەتزانی خاکی کوێت بەنسیب بوو.

تۆ بلێی گۆڕستانی مەولانا خالیدی نەقشبەندیە یا گۆڕستانی شەهیدانە.. وێڵو نات دۆزمەوە.. لەدووره وڵات کۆچت کردو نەگەڕایتەوە.. نەتزانی دایە لەسوێی تۆ کۆچی کردو ئێمەتان بۆ خەمی دنیاو منالەکان هێشتەوە... خەم رەوێنەکەم، کۆچەکەت بەبارستایی تەمەنم خەم بوو.. هەموو هاورێیانت، دۆستان.. ئەوانەی کە رۆژێک تۆیان ناسیبێ بە دڵو گیان بۆت بەخەم بوون..

ڕەش پۆش بوون.. شینی تۆ، کۆتەڵی شینی تۆ.. بووکانە بووکانە ڕۆڕۆ بوو، حەڵقەو چلە جوانەکانت هەڵواسرا بوون... وێنە جوانەکەت، وەرزی بەهارو نەورۆز هەموو پرسەکەتی گەرم کردبوو.. هەرکەسێ لەبەرتۆ غەمی خۆی لەیاد کردبوو.. هەموو بورکانێکی گڕگرتوو بووین، دەنگمان، سنگ کوتانمان، نرکەمان گوێی کەشکەلانی فەلەکی گرتبوو.. تۆ تەمەنت گوڵو گوڵاڵەو نێرگز بوو.. تۆ هەرزەیەکی خێر نەدیوو بووی.. سە دان ئاواتت هەبوو نەهاتە دی.. تۆ بەواتای خەڵکان جوانو قەشەنگو سالارو میوان پەروەر بووی.. دایکێکی بە ئارامو خۆنەویست بووی، بۆیە خوا شاگوڵیماڵەکانی بردەوە.. ئای لەو نەورۆزەی (٢١)ی ئازار چەقرچەو سۆیەکی نا بەدڵمانەوە هەرگیز ئەو ڕۆژە لەیاد ناکەم، خەڵکی لەجەژنان، من لەیادگاریەکانی تۆدام.. منالی بێ دایک، باوکی بێ ژن، خوشکی لێ تۆراو، مالی هەڵپێچراوو دابەش کراو، خانووی داگیرکراو لەلایەن میریەوە، منال و باوک لەیەک بەجێ ماو بوونە کەرەستەی شینم.. لەژیانما شینم نەکردبوو تۆ منت تەقاندەوە.. چی بڵێم و چی بێژم ئازارەکەی ئێمە گەلێ سەختترە لە ئازاری تۆ.. تۆ کۆچت کردو ئێمەت خستە کەربەلای عەشق و شینەوە.. تۆ چوویتە دنیای فانیو ئێمە لە خەمی تۆدا مەلەوانێکی تازەین.. ئای لەو ڕۆژەی تۆ کۆچت کرد.. ژیانم لی بووە دۆزەخ.. لەکاتی ژانا هاوارم بردە بەر پیاوچاکان و مشایەخان عیلاجی دەردێ. چلی حەوت هەتیوم قەراردا شفایە بۆ تۆ بێ.. سەردانی چەندین پیاو چاکم کرد.. بە شەو تابەیان ئەستێرەم دەژماردو لەرووناکی مانگ و ئەستێرەکان دەپاڕامەوە.. نەمزانی ئەستێرەکانیش لێم تاریک بوونو ژیانم دەبێتە پایزێکی زەردی گەلا هەڵوەریو، توخوا خوشکە ئازیزەکەم.. تۆ بڵێی ڕۆژێک بێمە سەر گۆڕەکەت و تێر تێر بۆنی مەزارو خۆڵی سەر قەبرەکەت بکەم، لەئامێزت بگرم و سەبری ئەیوبم بشکێ.. جارێکی تر هیچم لەدەست نایە بەرهەمی چەندین ساڵەم پێشکەشی گیانی تۆی (٣٢) ساڵە بکەم، پێشکەشی سەرجەم شەهیدانی کوردستان لەسەروو هەمووانەوە بارزانی نەمرو شێخ مەحموودو قازی محەمەدو هەموو مرۆڤێکی کوردپەروەر دەکەم.

**شوکریە ڕەسووڵ**

# پێشکەش

بۆ بەدری خان ئەو خوشکە شیرین دیمەنو دڵگیر شێوە لێ هاتووە وێنە دەگمەنە بێ کەهەمیشە جێگەی هەموو ڕیزو خۆشەویستیەکی پاك و بێ گەردی بێ نیازی برایانەمەو بەس،

بۆ ئەو خوشکە کارامە سەنگینو سەللارەی کەپەیکەرێکی خوایی جوانی و جگەر سۆزی و بەرائەتەو چرایەکی هەمە وەختیەی پڕشنگداری گوفتارو ڕەفتارو خوویی بالاترینە بەچەشنێکی واکەشایانی شانازی بەرەی ئافرەتانی کوردستان بێو بشێ بۆ نموونە نیشانی نیشانی گەلانی دەرەوە بدرێ کەئائەمەیە وینەی کیژی کورد!

بۆ ئەو خوشکەی کەلەکاتێکدا بەڕای من شایانی بۆ تەرخان کردنی هەموو دەریای الهامو شیعری باسو ستاییشەو بەلام بەداخەوە باڵی کورتم تەواو نەگەییە ئەو دەریایە کەلەم چەند مشتەی زیاتر بۆ هەڵ بیەنجم کەوا بەتکای لێ بووردنمەوە پێشکەیشم کرد.

**لەبرات فەرزتر ع. بەسۆز**

**سلەیمانی . دووشەممەی ٣١/مایس/١٩٧٦**

[illegible]

ڕۆژی شەممە ١٩٧٥/٦/٢٨

## (بدری) ئاسمان و بەدری ئەرز!

پەیکەرێکی جوانی دیمەن و ڕەفتار

لانەگایی پۆلی دڵان بەهەزار

ئەبێ لەکوێدا هەڵ کەوێ هی‌وا؟

مەگەر ئەفسانەو ماهی کردگار!

دەنگێ لەباڵای سەروو هاتە گوێم

ووتی: نە.. هی من دوو ڕووەوە بێ بار

شەو لەڕاهی خوا خۆر خێر پێ کردوو

ڕۆژ کەلێی برڕا سیسەو خەفەت بار

بەڵام (بەدری) ئەرز خوا بەهرە پێ بەخش

ڕۆژو شەو تیشک و تریفەی بەرقەرار

ع. بەسۆز - ١٩٧٥/٦/٢٨

---

**بۆ سەرنج:** ئەفسانە مەبەست لەحکایاتی خەیاڵی‌و ئەساطیرە: ماهی کردگار مەبەست لـەمانگی سروشتی‌یە، (باڵات سەروو) مەبەست لەئاسمان و عەرشی بڵندە.

واتە: بدر شەوق لەخۆر (ڕۆژ) وەرئەگرێ لەسایەی ڕەحمی خواوەو دیـارە شەفیشی موەقتـەو ،ایمی نیە، بەڵام بەدری ئەرز (واتە بەدری خان) هەر یەکسەر خوا بەهرەی لەلایەن خۆیـەوە پـێ بەخشیوەو بۆیە شەوو ڕۆژ شەوقدارە.

# پێشکەش

بۆ بەدری خان ئەو خوشکە شیرین دیمەن و دڵگیر شێوە لێ هاتووە
وێنە دەگمەنەی کە هەرێشە جێگای هەموو ڕێزو خۆشەویستییەکی پاک و
بێگەردی ~~...~~ بێ نیازی برایانەو بەس ،

بۆ ئەو خوشکە کارامە سەنگین وسەلارەی کە یەکەرنگی خوایی
جوانی و جگەرسۆزی و بەرائەتە و چرایەکی هەمووە ختینەی پرشنگداری
گوفتارو ڕەفتارو خووی باڵا ترینە بە جەشنێکی واکە شایانی
شانازی بەرێ ئافرەتانی کوردستان بێ و بشێ بۆ نموونە نیشانی
گەلانی دەرەوە بدرێ کە ئائەمە وێنەی کیژی کوردە! ،

بۆ ئەو خوشکەی کە لەکاتێکدا بەڕای من شایانی بۆ تەرخان کردنی
هەموو دەریای ئیلهام و شیعری باس وستایشە و بەڵام بەداخەوە
باڵی کورتم تەواو ناگرێتە ئەو دەریایە کەلەم چەند شتەی زیاتر
بۆ هەڵ نەبەنجم کەوا بە تکای لێ بووردنەوە پێشکەشیم کرد ←

برات فرزتر ع. بەسۆز
سلێمانی . دووشەممە ٢٠/ مایس/ ١٩٧٦

# جوانترین پەیکەر

تریفەی بەدری ڕووی بەدری لە_ غابات و کشت و کاڵا
بۆ ڕەواجی جەوهەرە: گوڵ و پیت و سەرووی باڵا
گەر ڕەونەقی لۆلۆی و یست لەسەر زێری جوانی ڕەوشت
وەرن سەیری جەمالی کەن لەپەیکەری پڕ کەماڵا
دیارە لەعەزرەت قامەتو بەژنی بەرزو ناسک قەدی
هۆشی عالەم بوو بەلاو لاو لەعەرعەرو چنار ئاڵا
حەیاو حورمەت، سام و هەیبەت، لطفو وقار لە(بەدریا)
یەک لەیەکتر ئاشکراتر خۆی دەرئەخا چەشنی ئاڵا
سۆزی بڕوام ئەڵێ بەدری هەزار ڕەحمەت لەشیرت بێ
کەبوونی تۆ ڕۆشناییە لەهەر شوێن و لەهەر ماڵا

ع. بەسۆز
١٩٧٦/٢/٢٠

---

بەیتی یەکەم: غاباتو کشتوکاڵ. مەبەست لەو دوو دایەرەیە کەغابات دارستان‌و درەختو کشتوکاڵ زەراعەت پیشەکاریانە. گوایە ئەم دوو دایەرەیە بۆیە بەدری خانی شوعلەداریان گرتۆتە خۆیان بۆ دعایەی سێ مەبەستە ١_ گوڵ و بەر ٢_ بەرەکەت لەخێرو بەریا، ٣_ نیشاندانی شێوەی جوانی درەخت و دار لەسەروو و عەرعەرا. واتە بەدری خان لەم جەوهەرانە پێک هاتووە.

بەیتی دووەم: واتا: ئەگەر ویسترا ڕەونەقی لۆلۆی بریقەدار ببینرێ کەوەک سەنگو نقێم چەسپاوە لەسەر هەیکەلی ئاڵتوونی جوانی ڕەوشت خود یادە وەرن سەیری کەن چۆن لەدیمەنی جوانی تەواویا لەگەل یەک گونجاون!

بەیتی سێهەم: وادیارە لەعەشقی بەژن و باڵاو شۆخ و شەنگی‌و نازقەد باریکی‌و ناسکی تۆیە کەوا هۆشی‌و شعوری دڵداران وەکوو لاولاو لەعەرعەرو چنارو ئەئاڵێن. چونکە دیارە کەگوڵی لاولاو طبیعیا لەشتی بەرز ئەئاڵێ.



جوانترین پەیکەر بەدریە رسول

# جوانترین پەیکەر

ترێفەی بەدری ڕووی بەدری لەسە غابات وکشت وکاڵ
بۆ ڕەواجی سێ بەهارە: گوڵ دەبێت و سەروی باڵا
گزیرە و زنجی لۆلۆئات ولیست لەسەر زێڕی جوانیی پەروەشت
وەرن سەیری جەمالی کەن لە پەیکەری بێ کەماڵ
دیارە لە عەزرەتی قامەتو بەژنی بەرز و ناسک قودی
هۆشی عالەم بوە بە لاولاو لە عەرعەروچنار ئاڵا
حەیا و حورمەت ، سام و هەیبەت ، لطف و وقار لە بەدریا
یەک لە یەکتر ئاشکراتر خۆی دەرئەخا چشنی ئاڵا
سۆزی بەرپوام ئەڵێ بەدری هەزار ڕەحمەت لە شیرت بێ
کە بوونی تۆ ڕۆشناییە لە هەر شوێن و لە هەر ماڵا

ع . بەرزنجی
١٩٧٦/٢/٢٠

# ڕێ و ڕەسمی شین و لاوانەوە
# لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا

**پێشەکی:**

ئاشکرایە لەڕووی فراوانی ئەدەبی فۆلکلۆری و ئەدەبی نووسراودا کورد خاوەنی سامانێکی فراوانی کەلەپووری نەتەوایەتی‌یە. گومانیش لەوەدا نەماوە میللەتی کورد یەکێکە لەنەتەوە هەرە دەوڵەمەندەکانی ڕۆژهەلات. هۆی ئەمەش ژیانی تایبەتی کوردو وێنەی جیاوازو گۆڕانی زوو بەزوو دەرکەوتن ئەم وێنانە بوونەتە هۆی ئەم دەوڵەمەندی‌یە، هەروەک بوونی چەند دیالیکتێک هێندەی تر دەوڵەمەندی کردووە.

هەروەها زروفی تایبەتی وای کردووە کەبەشی زۆری ئەدەبی میللی بەناوی خاوەنەکەیەوە بڵاونەبێتەوەو ئەمەش دەماودەم و پشتاوپشت بمێنێتەوەو بخێتە سەر گەنجینەی فولکلۆرمان[1].

لەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆ یەکەمجارە بەشێوەیەکی زانستی لەدەستووری شین و لاوانەوەی کوردەواری ئەدوێین، ئەلبەتە ئەم بابەتە پەیوەندیەکی پتەوی بەداب و نەریتی ناوچەکانەوە هەیە.

هەروەک وتمان ئەم لێکۆڵینەوەیە یەکەم هەوڵدانە بەشێوەیەکی فراوان کرابێ، چونکە زۆربەی لێکۆڵەرە ئەتنۆگرافی‌یەکان تەنها دەربارەی لایەنی داب و ڕێ و شوێنی بەڕێ کردنی مردوویان نووسیوەو ئەمەیان خستۆتەڕوو کەئەم نەریتە یەکسەر دوای مردنی مردووەکە کەس و خزمە نزیکەکانی دەست بە شین و

---

[1] د. عیززەدین مستەفا رەسول -ئەدەبی فولکلوری کوردی- لێکۆڵینەوە -بەغدا- ١٩٧٠ -ل.١٠.

لاوانەوەی ئەکەن[1] بێ ئەوەی هیچ تێکستی شین و لاوانەوەیان لەکارەکانیاندا بەکارهێنابێ‌و بیکەن بەبەڵگە بۆ قسەکانیان[2] بەڵام لەئەدەبی نووسراودا ئەم بابەتە وەک سەرەتایەک لەفەقێ‌ی تەیرانەوەو دوا بەدوای ئەو شاعیرەکان ئەم بابەتەیان وەک غەرەزێکی شیعر بەکارهێناوە.

**هۆی نووسین و هەڵبژاردنی ئەم بابەتەم لەبەر چەند هۆیەک هەڵبژارد:**

١- تاکو ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانسی دەربارەی شین و لاوانەوە لەئەدەبی کوردیدا (فۆلکلۆرو نووسراو) نەکراوە.

٢- لەبەر گرنگی ئەم بابەتەو لەترسی لەناو چوونیان هەوڵم داوە لەم بابەتە بدوێم.

٣- ئەم بابەتە بەباتێکی فراوان دەژمێررێ لەڕووی دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردی‌یەوە.

٤- کۆمەڵێ داب و نەریتەی شاراوەی گەلەکەمان لەشین و لاوانەوەو داب و مردوو ناشتندا لەمێژووی کورددا بۆ دەرئەکەوێ.

٥- بەشداری کردنم لەشین و لاوانەوەی نزیکترین خۆشەویست (بدریە)ی خوشکم، تاکو ئیستا نەمتوانیوە بەنووسین هەستی خۆم دەربڕم، تا دڵ و هەناوم نەسووتا نرخی ئەم ئەدەبەم بۆ دەرنەکەوت.

بەگشتی ئەم بابەتە پەیوەندی بەژنانەوە زیاترە تاکو پیاوان.

---

[1] بروانە: س-یەگیزاروف- کورتە مێژوویەکی ئەتنۆگرافی کوردی -یەریڤان- تفلیس -١٩٨١ -بەرگی ١٣-ل٥٣ -بەزمانی رووسی.
- گ.ف. چوورسین -کوردەکانی ئازەربایجان -تفلیس- ١٩٢٥- ل١٠.
- ئۆ -ل- فیلچیفیسکی -کوردەکانی موکریان -مۆسکۆ- ١٩٥٨ -ل٢١٦.
- مەلا مەحموودی بایەزیدی -عاداتو رسوماتنامەی ئەکرادیە- وەرگێران و پێشەکی (م.ب. رۆدێنکۆ) -مۆسکۆ -١٩٦٣.
- ت.ف. ئەریستۆڤا -کوردەکانی پشت قەفقاز -مۆسکۆ- ١٩٦٦ -ل١٦٤.
- هینی هارۆڵدهانس -ژیانی ئافرەتی کورد -وەرگرانی (عزیز گەردی) -بەغدا -١٩٨٣-. ل٣١٤-٣٢٤.

[2] م. رۆدێنکۆ -کتێبێکی دەربارەی شینی کوردەکانی پشت قەفقاس نووسیوە، توانیویەتی دەستووری شین و بەیتی لاوانەوە لەدەمی کوردە یەزیدیەکان بنووسێتەوە.

# نه خشـــه ی به شـــ

## فۆلکلۆر

هه مه ره نگ ٢     شیعر ٢



# ـــه كانى فــــۆلكلــــۆرى كـــــوردى

## Folklor

**پەخشان ١**




قارەمانی

دڵداران

**گۆرانی بۆنە**

١ منالّ بوون

٢ نیشانەکردن

٣ خەتەنە سووران

٤ بووك بردن ( گواستنەوە )

٥ خەنەبەندان

٦ ئێشك گرتن

٧ هەڵپەركێ و شایی

٨ گۆرانی ئایینی

٩ شین و لاوانەوە

دووركەوتنەوە لە ( نیشتمان و كەسووكار )

**گۆرانی رۆژانە**

١ گۆرانی منداڵان و گەوران

٢ گۆرانی لای لایە

٣ گۆرانی دڵداری

## زاراوەی شین و لاوانەوە :-

شین و لاوانەوە شوێنێکی دیارو تایبەتیو گەورەی لەئەدەبی کوردی گرتووە. ئەم بابەتە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بەژیانی کۆمەلایەتیەوە هەیە، کەئەویش مەسەلەی مردنە. ئەم بەشە لەئەدەبی سەرزارییو ئەدەبی نووسراودا گرنگیەکی چاکی پێ دراوە، دەولەمەندی ئەم بابەتە بەپێی شوێن و باری جوگرافیاو ئەو زارە کوردیانە ئەگۆڕێ کەکورد قسەی پێ دەکات.

ئەم بەشە لەهەر شوێنێک لەشوێنەکانی کوردستان دا ناوێکی تایبەتی هەیە. ئەم ناوانەش لەڕوخساردا جیان، بەلام ناوەڕۆکیان هەریەکەو بۆ یەک مەبەست بەکار دەهێنرێن. بۆ نموونە کوردی عێراق و ئێران لاوانەوە، بەیتی شین و شەپۆر، چانیە، شیوەن، سەردولکە، گریان، شین )ی پێ دەڵێن.

کوردەکانی تورکیاو سوریاو یەکیەتی سۆڤیەت (بەیتی شین) یاخود (کلامێ شینێ)ی پێدەڵێن، کوردەکانی عێراق شین و لاوانە یا سەردولکە، شین. کوردەکانی لور شینی چەمەری پێ دەڵێن. بەڵێ جۆش رامانی مرۆڤ بەرامبەر ئەم ڕووداوە ترسناکە کەناوی (مردن)ە ئەیخاتە بارێکی کۆتایی نەبوون و نەمانە. جالێرەدا لاوێنەر قرمێسک و بیرکردنەوەی تێکەلاویەک ئەبێ یادگارو شێوەو ناکامی جوانی مردووەکە دێنە بەرچاوی. مردن قەدەرێکە ڕزگار بوونی بۆ نیە... هەموو مرۆڤێک ئەبێ ئەو ڕێگایە بچێژێ. هەروەک پەندێکی عەرەبی دەڵێ:-

(ئەوەی ئەمڕۆ ئەیلاوێنێتەوە سبەینێ بۆ تۆش ئەلاوێنرێتەوە )[1]

## پێناسەی لاوانەوە :-

لاوانەوە، هونەرێکە لاوێنەر یا شاعیر لەهەست و سۆزی خۆشەویستییەوە بەرامبەر بەمردووەکە دەری ئەبڕێ بۆ مردووەکە دەگرییو هەموو خاسیەتە جوانەکانی دەژمێرێ. ژیان و مردنی مردووەکە وێنە ڕێژ دەکات[2].

[1] مظفر عبدالستار غانم -الرثاء في الشعر العصر العباسي الاول -بغداد- ١٩٨٤-ص١١٢.

[2] علي بو ملحم -فنون الادب -بيروت- ١٩٧٠ -ص٨٣.

بەیتی شین و لاوانەوە بەرهەمێکی داهێنراوی زۆربەی خەڵکەو یەکێکە لەشاکارە نموونەییەکان و فۆلکلۆر. نەداستانێکی کۆن و پەیکەرەو نەئاسەوارە. بەڵکو ڕووداوێکی زیندووی هۆنراوەیە[1].

شین و لاوانەوە: دەربڕینێکی قووڵ و ناخۆشی غەمباریو دڵتەنگییە بەشێوەیەکی شاکارانە. ئەمەش ڕێگا خۆش ئەکا بۆ ئاوڕدانەوە لەو نهێنییانەی لەگیانی کۆمەڵانی خەڵکدا شاراونەتەوە. کەسامانێکی دەوڵەمەندە ڕازونیازی دەروونیانی تیا ئەبینرێ[2].

## جۆرەکانی لاواندنەوە:-

هەروەک وتمان لاوانەوە ئەنجامی مردنە، ئەگەر مردن و لەناو چوون نەبووایە شیعری لاوانەوەش دروست نەئەبوو. مەسەلەی مردن و ژیان یەکێکە لەو کارانەی کەهۆشی مرۆڤی هەر لەکۆنەوە جولاندووەو پاڵی بەگەلێ پرسیاری نامۆوە داوە: بۆچی مردن هەیە؟ لەکوێ هاتووە؟ بۆچ شوێنێک ئەمان بات؟

هەرچەندە هەموو ئاینە ئاسمانیەکان ئاگاداری هۆی مردن و بوونو نهێنی مردنو نەمانی بوونن.

(مبردی) عەرەب دەڵێ:-

**(شین و لاوانەوەو هۆکانی هەتا مرۆڤ بمێنی هەردەمێنێ)**

## بنەمای هونەری (ڕوخساری لاوانەوەو شینی کوردی)

١_ بەیتی لاوانەوە بریتییە ل(دوو، سێ_ چوار، پێنج، شەش) بەیت.

قافیەی بەیتەکان /ئا ئا ئا/ ئا ئا/ ب ب/.

٢_ ئەم بەیتی لاوانەوەیە نەگۆڕن.

٣_ لەکرمانجی ژووروودا سەر بەیتەکان دووبارە نابنەوە[3].

---

[1] م.ل. ئازادۆفسکی -لاواندنەوەی لینسکی (گوندیکە لە هەریمی سیڤرولۆن)- ١٩٢٢-ل١٠- بەزمانی ڕووسی.

م رودنیکو -شینی کوردە یەزیدیەکانی پشت قەفقاز -گۆڤارێکی پالتینسکی سورینک -ژ٢١(٨٤)-١٩٧٠- بەزمانی ڕووسی.

[2] بڕوانە: ک.ڤ. چیتۆڤ- لاوانەوە- لینگراد -١٩٦٠-ل١٠- (بەزمانی ڕووسی).

٤- بەڵام لەکرمانجی خوارووودا سەر بەیتەکان دووبارە ئەبنەوە.
٥_ لاوانەوەی کوردی کورت بڕییە بەبەرزترین دەربڕینی هەست ئەژمێردرێ کەزیاتر کار لەگوێگر ئەکات.
٦_ زمانی لاوانەوە پڕە لەخوازە (سیارێ ئەسپی دیل بەردان).
(چاوم دەگێڕم سەرداری ماڵ نابینم) . (ڕۆڵە خێر لەخۆنەدیوەکەم).
٧_ شینی کوردی لەکرمانجی ژووروودا بەمە دەست پێ ئەکات.

(لۆ _ لۆ _ سیاڕۆ)
(هەی _ لۆ _ سیاڕۆ)
(لۆباڤۆ _ هەی _ لۆ برایۆ)

بەڵام ژنان ئەڵێن:

_ لێ _ دایێ، لێ وایێ (لێ ڤایێ، لێ ڤایێ)

لەکرمانجی خوارووودا: زاوا ڕۆیە، بوکانە، بوکان، وەی وەی شێرە.
٨_لەشینی کوردیدا کێشی پەنجە زۆر بەرچاو ئەکەون، زۆرجار برگەکان (١٠-٢٥) برگە ئەبێ، زۆر جاریش قافیەگان یەکن.

وەکو: دە برگەیی: هەی شەڕە شەڕ شەڕ لەقەراجی
دەنگی تۆپان دێ لەچیای باواجی
برینی ئەو لاوە نەکرا عیلاجی

## ڕوخسارو پێکهاتنی کێش لە لاوانەوەی کوردیدا:-

بەگشتی ڕوخساری لاوانەوە بریتییە لە(بەیتێ، دوو، سێ، چوار،.... هتد)
قافیەکانیش ئەمانەیە (ئائاب ئا، ئائا ب ب، ئا ئا ئا ئا)، لەزۆربەی ڕووداوەکاندا بەشێوەیەکی خوازەیی ڕەگەزەکان دەرئەکەوێ، ئەتوانین خاسیەتەکان لەمانە دەست نیشانی بکەین:-

١_ ڕاستی یاخود شێوەیەکی خوازەییو خەیاڵی لەڕوخساری لاوانەوەدا دیارە:-
لەچاوما هەورو نەمە

(دڵەکەم: باڵندەی هێلانەی قەبرم)

٢_ زۆرجار مردووەکە بەکەرەستەی ناوماڵ ئەخوازرێ.

- لانکە کۆنینەی ماڵم
- تۆ بنکەو ماڵکەری ماڵم بووی کابانێ

٣_ وێنەگرتنی سروشت و چیای کوردستان (شتی ڕاستی سروشت).

- گوڵی بەهاری کوردستانم شێواوە
- ئەستێرەی ئاسمان شەوقی نەماوە
- ئاسمان شێواو، باران ئەبارێ
- بەفری چیاکەم ناتوێتەوە

٤_ بانگ کردن یاخود قسەکردن و ماڵ ئاوایی لەوانەی دەوروبەر بەزمانی مردووەکەو خێزان و هۆزەکەی دەکرێ.

- ئەی دایەی بەدبەخت، تۆ لێم دووریو لەکۆچەکەشەم
- ئەی براکەم لەخەو ڕابە
- بابەگیان بۆچی چارەو بەختم وا سیابووە

٥- شوێن: لەکوێ بۆ مردووەکە ئەگرین یاخود لەکوێ گوییان لەگریان و هاوار بووە بۆ مردووەکە.

لەلاوانەوەدا وێنەی خزمی نزیکی مردووەکەو پەرۆشیان بۆ مردووەکە دیارە:-

لەدەرگای ماڵەوەمان جوانترین سواو (سەردار) هاوارو شینی بۆ مردووەکە دەکرێ. ماڵ ڕما، ئەژنۆمان شکاو پشتمان چەمیەوە

خەم لێم بارییوە کابانی ماڵێ کەبێ پشت و کەسی مایەوەو بێ هۆزە کە زۆرجاریش بەیتەکانی تر بەم خوازە دەست پێ ئەکات وەکو:-

- چاڤێ خۆ دگەرینم، سیاری خوە نابینم
- یا هاتە سەرێ مە، برانێیە سەر گورێ چیا، گور گونتیە.
- خێن ژ ئاخێ گورا کەو، ل من نایێ[1]

---

[1] مەراسیمی مردوولاوانەوە -م.ب. -رودنیکۆ -مۆسکۆ-١٩٨٢-ل٤٢.

- زۆرجار گفتوگۆ لەنێوان حەکیم و کەسانی مردووەکە ئەکرێ دەربارەی چارەنەکردنی مردووەکەو نەدۆزینەوەی دەرمان و چارە:-

یاخوا دکتۆران دەستان نەناڵێ
دەرمانی (جوانەمەرگ)م بۆ بێتنە ماڵێ

سەروا لەشینی کوردیدا ئاشکرایە سێ بەیتی ئائائاو لەچواریندا ئائا ی ئا/ ئائا ی ی، پێنجیش ئائا ی ی ی، بەڵام ئەگەر گەیشتە شەش نیوە بەیت ئەوە ئەوە قافیەکانیان سەربەست ئەبێ:

سێێ / ئەزێ هەرمە ناڤا گورسینە
پرسەکە بکەم ژ دەرگەڤنە
برا مەزە لەطەریب زو بڤنە
چوارینە/ حەکیمێ حەکیم کێشیە
ئەزێ دەستەکە باڤێمە ئەتاکی یەکێ باڤێمە پێشە
بێژم حەکیم، تۆ خودێ کەی
بدە براکێ من دەرمانێ ڤێ دلێشێ

× ×

ئەزی ناسەکنم بلند چیا
تۆزێ خوبارە ئاڤێتە دەڤێ مە نەگیا
خوشکی مەعرومە چاڤێ خوە دگرینە
برانگێ خو ناڤە پسماما نائێنە

× ×

لوریکا من دارینیە
دایێ مەعروومە، لوریکا خوە هلدە ناڤا پسماما بگەرینە
لوریکا من زارەکەچێ‌یە
دەلالە دلێ دێیە
لوریکا برەڤینە مالا کالکێیە

- زۆرجار سەر وای شینەکان وەکە یەکن زۆربەیان لەسەر کێشی ڕەسەنی دەبرگەین. سەرواکان یەکن:

ڕۆڵە خودا نەکە د گل وەباند بود
لەژێر ئەو گڵە گۆڵ سەیواند بود

کۆچی دوایت کرد ڕۆڵەی داماوم
ڕوناکی دل و هێزو هەناوم

بەگشتی سەروا لەشینی کوردیدا بەم جۆرەیە:

١_ سەروای یەککرتوو.
٢_ سەروای هەمە ڕەنگ.
٣_ سەروای مەسنەوی.

## دۆخەکانی مردن و شین و لاواندنەوە:

شین و لاوانەوەو هۆکانی، هەتا مرۆڤ بمێنێ هەر دەمێنێ، چونکە کارەسات کۆتایی نایەت تاکۆتایی کارەساتەکە نەیت، ئەمەش نامێنێ تاکو ئەوانەی لەسەر زەوی ئەژین کۆتایی پێ دێت.[١]

کەواتە لاوانەوە وێنەی هەڵویستی مرۆڤە بەرامبەر مردن و ئەو مرۆڤە مەزنەی کەژیانی پێ دەبەخشرێو لەچاو تروکانێکدا دەیباتەوە، وەکە (هەر نەبووبێ) لەو کاتە دەترسێو دەلەرزێو بانگی دەکەن. خەڵک و خێزان و خزمی مردووەکە دەڕۆنە ماڵە مردوو و یادی دەکەنەوە، ئاکامە جوان و چاکەکانی باس دەکەن.

## ئەو دۆخانەی بەسەر مردوودا دێت:-

لەداب و نەریتی کوردیدا وەکو نەریتی ڕۆژهەلاتی مردن بەسەر سێ دۆخ دا تێ دەپەڕێ:_

[١] التعازي والحرائي... ص٢٧١

یەکەم: شین و شەپۆڕو لەخۆدان و هاوار کردن بەسەر مردووەکەدا* .

دووەم. دەستووری شین و پرسە دانان بۆ ژنان و پیاوان.

سێیەم: پرسە یا ڕەشپۆشی.

ئەو سێ لایەنە لەتەعزیەکدا کۆدەبێتەوە.

## یەکەم/ شین و شەپۆڕ:

کاتێ لاوێنەر یا شاعیر بۆ مردوو دەگریو بۆی دەسووتێ پێی دوترێ (شین و شەپۆڕ) ئەمەش وێنەی ئەو کار تێ کردنە پیشان دەدات کەدوای مردووەکە تووشی شاعیرو کەسی نزیکی مردووەکە دەبێت. وەک بیر ئالۆزیو پەشێویو بێ هێزیو غەمگینی کە لەدڵ و دەروونیان تروسکەی ڕووناکیو هیوای تیا نابینرێ. دونیای جوانی لاتەسک و ناخۆش دەبێ، دڵ پڕ خەم و ئاخو ئۆفو حەسرەتی. بێ ئومێدی لێ هەڵدەستێ فرمێسکی ڕێژنە ئاسا دێتە خوارێ.. ئەم جۆرە لاوانەوەیە سۆزێکی ڕاستگۆیانەو ڕاستەقینە دەگرێتە خۆی، چونکە دەربڕین لەکارەساتێکی ناخۆش دەکات. ناخۆش دەکات کەلاوێنەر پێوەی دەناڵێ. جا ئەو کەسەی کەلێی ون دەبێ کوڕ یان ژن یا برا کەسێکی خۆشەویستیەتیو ڕوخساری لەگەڵ کەسانی تەعزیەکەدا تێک دەچێ. لەم کاتەدا ژنان دەست بەشین و لاوانەوە دەکەن و هاوارو بانگەوازیان دەرو دراوسێ ئاگادار دەکات. بەمردنی مردووەکە کەسی نزیکی مرووەکە قژو دەم و چاویان دەڕنن و خۆیان لەقوڕ دەنێن لەسەر ئەو کارەی کەڕۆژگارو کردگار پێیانی کردووە* . لەم دۆخەدا دابی شتنو ناشتنی مردووەکە دەست پێ دەکات.

---

- لەکوردەواریدا کاتێ مردووەکە گیانی دەردەچێ بەپێی دەستووری ئیسلام دەست و قاچی درێژ ئەکەنو چاوەکانی‌دەنوقێنن بەدەسرۆکەیەک چەناگەی دائەنێن و ڕووی بەرەو قیبلە دەکەن.

* ئەم دیاردەیە لای عەرەبەکانی پێش ئیسلام واباو بووە کەژنان بۆ مردووەکە یان خۆیان لەقوڕ ئەناو سەریان دەتاشیو گیرفانەکانیان دەدڕان. لەکوردەواریشدا لەناو هۆزی دەشتەکی ژنان پرچی خۆیان یاخود بەشینەوە لێی دەکەنەوەو بەدەستیانەوە دەی پێچن و دەم و چاوی خۆشیان بریندار دەکەن و خۆیان لەقوڕ دەنێن.

وەک ئاشکرایە شینی کوردی پەیوەندی بەدابی ناشتنەوە هەیە، ئەم داب و دەستوورەش بەپێی ناوچەکانی کوردستان دەگۆڕێ چ لەناو کوردە موسلمانەکان یاخود یەزیدیەکان یان کاکەیی بێ، بەگشتی دەستووری شین لەلادێو شارەکاندا دەگۆڕێ هەر شوێنە جورە شین ولاوانەوەیەکی تایبەتی بۆ مردووەکە دەکەن کەلەمەودوا باسی لێوە دەکەین.

لەکوردەواریدا شین و شەپۆڕو لاوانەوە هەر بەرۆژ ئەکرێ، باوەڕێکی وا لەناو یەزیدەیەکاندا هەیە کەئەگەر شین و لاوانەوە بەشەو بکرێ ئەوە شوێنی مردووەکە لەناو گۆڕەکەیدا تەڕ ئەبێ. لای کوردە ئیسلامیەکانیش دەڵێن مردووەکە عەزاب دەدرێ.

شین و لاوانەوەش بەبەشێکی پێویست دادەنرێ چونکە ئەگەر شین و لاوانەوە بۆ مردووەکە نەکرێ ئەوە بەنەنگیو شورەیی ئەزانرێو هەروەها ئەوە دەردەخات کە نرخ و ڕێزی مردووەکە نەگیراوە.

## دووەم/ دەستووری شین و پرسە دانان:_

لەم دۆخەدا گریان و لەخۆدان دووبارە دەبێتەوە لەگەڵ باس کردنیو ناوهێنانی هەموو ئاکارە جوانەکانی مردووەکە. ئەم لایەنە زۆرجار تێکەڵ بەشیعری ستایش ئەبێ تەنها ئەوە نەبێ کەئەمە لاوانەوەیە بۆ مردووەکە قودامەی کوڕی جەعفەر دەربارەی لاوانەوەو ستایش دەڵێ:

هیچ جیاوازیەک لەنێوان ستایش و لاوانەوەدا نیە، تەنها لەدرکاندن نەبێ کەهەندێ وشەو زاراوە هەن نیشانەی ستایش دەبەخشن و هەندێکی تریشیان تایبەتن بەلاوانەوە، ئەمەش لەبابەتەکە کەم ناکاتەوە چونکە دەستووری شین و پرسە هەر ئەو ستایشانەیە لەژیانی مردووەکەدا بووە.[1]

لەتەعزێدا ژنان ڕوو لەماڵە مردوو دەکەن و هەستی خۆیان تێکەڵ بەغەم و پەژارەی ماڵە مردووەکە دەکەن و کۆمەڵێ زاراوەو وتە بەکار ئەهێنن کەنیشانەی بەشداریو دڵسۆزییانە، وەکو: وەی دەستم شکێ، چاوم کوێر بێ، ئاگرم تێ بەر بێ،

[1] علي بو ملحم - في الادب وفنونه _ بيروت _ ١٩٧٠ _ ص٨٦.

عەمرم نەمێنێ، هەلا هەلابم، ڕۆحم دەرچێ، حەلقەو زنێرم بۆ نیشانەی هێناوە، قوڕ بەچاوما دریێ، خوا سەبووریتان با، شەریکی غەمتانم. کەس و کاری مردووەکەش جارجارە وەلامیان دەدەنەوە بەگریان و لەخۆدان دەڵێن (من بمرم، من دەستم بشکێو چاوی خزمان کوێر بێ، عەمری خۆمان نەمێنێ، قوڕ بەچاوی خۆماندا بدریێ).

## ٣ـ ڕەش پۆشی یا پرسەگرتن:

ئەمەش لاوانەوەی سیفەت و کارە سوود بەخشەکانی مردووەکەیە، کەهەمیشە بەزیندوویی لایان دەمێنێتەوە. هەمیشە قسە خۆش و نەستەقەکانی زاخاوی مێشک بوون و مەبەستیش لەهەموو لەوانە سووک کردنی خەم و ئەو ڕووداوە گەورەیە کەتووشیان هاتووە.

لەم دۆخەدا شاعیر یاخود لاوێنەر نەدەربرین لەڕەوشتی مردووەکە دەکات کەلەشین و شەپۆردا دەیکردو نەکارە چاکەکانیشی دەژمێرێ هەروەک لەدەستووری شینا دەیکرد، بەڵکو دڵخۆشی خزم و کەسی مردووەکە دەداتەوە، ئەم دڵدانەوەیەش هەر لەکۆنەوە هەبووە تا ئیستاش هەر ماوە کە بۆ ئەم لایەنانە دەگەڕێتەوە:

ا ـ مردن قەدەرێکی چەسپاوە گۆڕان و هەلاتنی بۆ نییەو هیچ ڕێگەیەکیش بۆ لاوەنانی نییە.

ب ـ گریان و خەمگینی هیچ سوودێک نابەخشێو مردووەکە بۆ ژیان ناگەڕێتەوە.

جـ ـ هەموو کەسێک لەبەردەم مردن وەک یەکە لەکاتی مردنا هیچ جیاوازیەک نییە لەنێوان گەورەو بچووک/، پاشاو هەژارەا نییە.

ء ـ ژیان بەگشتی ماندوو بوون و کێشەو ئازارە. مردن تاقە ڕێگای چوونی مرۆڤە بەرەو ژیانێکی دوورو درێژی پڕ خۆشیو حەسانەوەو بەختەوەری لەو دونیایە.[1]

---

[1] علي بو ملحم - في الادب وفنونة _ بيروت _ ١٩٧٠ _ ص٨٧.

## داب و نەریتی مردوو شتن و کفن کردن و ناشتن:-

هەندێ دابونەریتی باو لەناو کوردەواریدا بەتایبەتی (کوردی موسڵمان) باوە کەمردووەکە ئەمرێ یەکسەر ئەنێرن بەدوای مردوو شۆر. ئەو شتانەی لەکاتی شتندا بەکاری دێنن برێتی‌یە لە:

١_ تەختەیەکی گەورە _ تاتەشۆر یاخود (مەشفەن).

٢_ مەنجەڵێکی گەورە بۆ ئاو گەرم کردن.

٣_ سابوون و لفکەو گوڵاوو لۆکە.

٤_ ئاو گردان (ئەو جامەیە کەئاوی پێ بەمردووەکەدا دەکرێ).

کەمردووەکەش دەمرێت سێ پارچە قوماشی سپی (بلوری یاخود خام)ی بۆ ئامادە دەکرێ پێ‌ی دوترێ (کفن).*

ئەو کەرستەو پێویستی‌یانەی بۆ ژنە مردوو ئامادە دەکرێ بەم جۆرەیە:

_ دووگردی (بەرماڵ) ی قیامەتی بۆ دەکەن.

_ کراسی قامەتی بۆ دەکەن.

_ ئاوەل کراس.

---

* دانیشتوانی ناوچەی پشدەرو کویەو دەوروبەری جوانترین ڕەوشتیان لەبارەی پرسەو بەڕێ کردنی مردووەکە هەیە کەلەزۆربەی شارەکانی کوردستان بەم جۆرە نیە، ئەگەر یەکێک لەم ناوچەیە بمرێ بەگشتی خەڵکی مردووەکە بەمردووی خۆیان دەزانن و نایەڵن تاسێ ڕۆژ فلسێک خەرج بکەن. ئەوەتا چەند گۆڕ هەڵکەنێک لەم ناوچانەدا هەیە کەخاوەنی پاچ و خاکەنازو بێڵن هەرکە زانیان مردوویەک هەیە یەکسەر دەچن بۆ گۆڕستان و گۆڕ بۆ مردووەکە هەڵ دەکەنن، هەرچی سەبارەت بەکەرەستەی قەبریشەوە هەیە ئەوە ئامادەکراوە بەتایبەتی لەحەوشی مزگەوتی گەورەو لەشاخەکانی قەندیلەوە بەرەو ئەو ناوچانە هاتووە. ئەمە لەلایەک لەلایەکی تر لەمزگەوتدا تاتەشۆرو تابوت لەهەموو مزگەوتەکاندا هەبووە. لەناوچەی پشدەر ئەوەش باوە مردوویەک هەژار بێ خەڵکی خۆی کفن و دفنی بۆ دەکات.

هەروەها لەهەندێ گوندی سەر بەناحیەی (بەردەڕەش)، بۆ نموونە گوندی (گردەپان) دابونەریتیان وایە ئەگەر یەکێک لەگوندەکە بمرێ، ئەوا لەکاتی تەعزیەدا لەکاتی نان خواردن پیاوەکان کەلەمزگەوت دەگەڕێنەوە ناچنە ماڵی مردووەکە، بەڵکو هەر جارەی یەکێک لەدانیشتوانی گوندەکە لەماڵی خۆیان شیویان بۆ دەکەن.

_لەچک و شەدادی بۆ دەکەن.

بۆپیاوانیش:

_ دوو بەرمالی قیامەت.

_ کراسی قیامەت.

_ لە چک و سەر پیچی بۆ دەکەن.

پاش ئامادەکردنی سێ پارچە بلووریەکە دوو پارچەی دەروورن و دوو قەدی دەکەنەوە.

## داب و نەریتی چۆنیەتی ششتنی مردوو:-

کە مردووەکە دەمرێ یەکێ لە ئاسیاوی مردووەکە ئەچێ بۆ مزگەوت و تاتەشۆرو* دارەمەیتی[1] دینێ.

لە کاتی شتنی مردووەکە دووکەس یا زیاتر خەریکی شتنی مردووەکە دەبن، یەکیکتان پێ ی دەڵین (مردوو شۆر) و پیشەی مردوو شتنە، ئەوەکەی تری ئاو دەهێنێو ئاو بە مردوکەدا دەکات لە سەرەوە بۆ خوارەوە، واتە نابێ دەستی لە نیوەی بگێرێتەوە بەڵکو ڕاستەوخۆ لە سەرەوەی مردووەکە تا خوارەوەی ئاوی پیادا دەکات بۆ ئەوەی دابی پاک و خاوێنی تەواو مسۆگەر بێ* لە ژوورەوەش کەسوکاری مردووەکە شین و شەپۆر دەکەن* ئەم گریانەی دەیکەن رەوشتێکی کۆنەو پێش ئیسلام هەرهەبووەو ئیسلام نکۆڵی لەشین و شەپۆر و لەخۆدان وپرچ

---

* ئەو ماڵەی کەمردووەکەی لێ دەمرێ تاسێ ڕۆژ تاتە شۆر نابەنەوە بۆ مزگەوت (تاتەشۆر بەو تەختە گەورە پانە دەوترێ کەمردووەکەی لەسەر دەشۆن).

[1] دارە مەیت: دارەباز قەفەزێکی لاکێشەیی‌یە بنی پانەو پێچکەکانی قوتەو لەهەردوو سەرێکەوە دوو دەسکی پێوەیە بۆ هەڵگرتنی.

* ئەوەی کە ئاوی پیادا دەکات دەبێ دوایی خۆی بشوات و خوی پاک کاتەوە. تا قورسایی مردووەکەی لێ بیتەوە.

* بڕوانە: ئافرەتی کورد _هینی هانسن _ عەزیز گەردی کردوویە بە کوردی - بەغدا _ ١٩٨٣ _ل٢١٧ _ ٣١٨.

ڕنینەوە دەکات. بەهەر حاڵ دوای ئەوەی کە مردووەکە شۆرا دەست نویژ دەگرن وکفنەکەی بۆ دەدروون، بەڵام ئەگەر مردووەکە شەهید بێ شۆردنو کفنو نوێژ لەسەرکردنی حەرامە.[1]

## دابی کفن کردنی مردوو:-

دوای ئەوەی لەشتنی مردووەکە دەبنەوە بە خاولیەکی پاک و خاوین مردووەکە وشک دەکەنەوەو کفنەکەی بۆ ڕادەخەن و مردووەکەی لەسەر دادەنێن.

کفن کردنی مردوو بە پێ ی تەمەن دەبڕێ، لە زۆر شوێن دا مەیت شۆر یا دراوسێ یا یەکێکی نزیکی مردووەکە بەبێ چەقۆ ومقەس خامەکە یاخود بلووریەکە دەکەن بەچەند پارچەیەکەوەو هەر پارچەیەی بۆشتیک دایدەنین، بەژنی مردووەکە لەسەرەوە تا خوارەوە بەخامەکە دەپیورێ. بۆ یەکەم جار لایەکی خامەکە بە تایبەتی لێوارەکانی لێ دەکەنەوە ئنجا دوو پارچەی گەورە گەورە، ئەوەی مایەوە دەکرێ بە چوار پارچەوە، دووانی لە شێوەی لاکیشەییدا، ئەوی تریش لەشیوەی چوار گۆشەییدا دەبڕیێو هەر لەم خامە پارچەیەک بۆ دەستکێشی مەیت شۆر دروست دەکرێ و مەیتەکەی پێ دەشوات. ئەو پارچە خامانەی کە پێیان دەوترێ (کفن) جیاوازیان هەیە لە پارچە پارچە کردنی خامەکە دەستوریکی وردو تایبەتی رەچاو دەکەن. خامەکە دەکەنە حەوت پارچە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو پارچەی لێ کەم دەبێتەوە کەمەیتەکەی پێ دەشۆن. تیلمێک لەو دوو تیلمە لەلێوارەکانی دەکەنەوە لەناوەڕاستەوە دەکەنە دوو پارچەو بەمەش ژمارەی پارچەکان دیسان دەبێتەوە حەوت پارچە، پارچە لاکیشە گەورەکەش ناوەڕاستەکەیان بەدەم تەرکرد تانوو بدرێ تا جێگای سەری مردووەکەی پیابچێو بەمە وەکو کراسێکی بێ

[1] بەپێ ی بیروباوەڕی ئیمامی شافعی وئیمامی ئەعزەم (ابو حنیفە) دەبێ شەهیدەکە لەبەرگ و پۆشاکی خۆیدا بێ دەست لیدان کفن بکرێ. بەپێ بیروباوەڕی ئیمامی ئەعزەم نویژ کردن لەسەر شەهید واجبە. ئەگەر مردووەکە قابلی شوردن نەبوو پیویستە (تیمیم) بکرێ و نیەت هینان سونەتە.
تیمم_ بەوە دەلین ئەگەر مردووەکە شۆردنی لە تواناادا نەبوو یەکیک دووجار دەست بدا لە زەویدا ونیەتی (تیمم) بینێ و ڕوخسارو هەردوو دەستی مردووەکە مەسح بکا.
بڕوانە: ڕیگای بەهەشت_ مەلا عەبدول کەریمی مدرس _بەغدا _١٩٨٦_ ل١٦.

درووماندەی لێ هات. دوو پارچە چوارگۆشەیەکە بەسێ قولنچکی دەنوشتێتەوەو یەکێکی سەری مردووەکەی پێ دەپێچرێو ئەوی تر لەهەنیەی، ئەو تیلمەی کەلەخامەکەیان کردەوەو کردیان بەدوو بەشەوەو ئەم سەرو ئەوسەری مردووەکەیان پێ بەست.[1] یاخود هەر لەخامەکە بۆ ئافرەت دوو دەست کێش و دوو جووت گۆرەوی‌و لەچکێک و دەرپێ تا گیانی ئافرەتی پێ داپۆشن دروست دەکرێ. لەزۆر شوێندا لۆکەش بەکار دەهێنن بەتایبەتی بۆ پەنجەی دەست و قاچ و پشت گوێ‌و قورگ و ژێر بالی مردووەکە. بەباوەڕی خەلک بۆ ئەوە کەلەشی هەلدەوەشێ بەیەکتریەوە نەنووسێت و کفنی بێ درووماندەی لەبەر دەکەن، دوای ئەمانە بۆ مردووەکە (قەلقەلە) ئەکەن، ئەویش ئەوەیە کەبەرێکی خامەکە ئەکەنە بەر مردووەکە. بەپێی باوەڕی هەندێ ناوچەی کوردەواری ئەوکەسەی کە دەمرێ چی کرداری باش و خراپەی هەیە لەسەر ئەم قەلقەلەیە دەنووسرێت (دوای ئەوە فرشتە لێی دەپرسێ ئەوەی نووسراوە بەجوانی دەیلێت هەتا ئەگەر نەخوێندەواریتش بێت). لەهەندێ شوێنی تردا ڕێحانەو گولاو گولە مۆرت و مێخەک و ئاوی زم زم ئەکەن بەکفنەکەدا. پاشان پارچە خامەکە دەبڕنو هەندێ جار پارچەیەکی لێ دەکەنەوە (گوایە دەلێن بۆ نەخۆشی باشە).

که لەم دابە بوونەوە ئەوجا بەگوێی مردووەکە بانگ یاخود شەهادە دەلێن (تۆ موسلمانی لەسەر ئومەتی محەمەدی. وەلامی خۆت باش دەرەوە) ئەمەش سێ جار دووبارە دەکرێتەوە.

لەکوردەواریدا وا باوە ئەگەر منداڵێک بمرێ (پەلەوەر, مریشک یا کەلەشێرێک) سەر دەبڕن و سەری مریشکەکە لەگەل منداڵەکە دەخەنە ناو گۆڕەکەوە تا کەسی تر لەو مالە نەمرێ.

بەم جۆرە ژنان و خزمانی مردووەکە لای سەریەوە دادەنیشن و دەست بەشینو گریان دەکەن بەمانە دەلێن (دل شەوەت - دل گەرم) ئەوانەی شینەکەش دەکەن پێی دەلێن ( دل شکەستی _ دل شکاو)[2] پاشان دوو کەسی نزیکی مالە

---

[1] بڕوانە: ئافرەتی کورد _ هینی هارولد هانسن... ل٣١×_٣١٩.

[2] م. ب ڕوینکو..... ل٣١٧ - ٣١٨.

مردووەکە دێن و مردووەکە دەخەمە ناو دارەمەیتەوەو* بەشێوەیەکی جوان، جاجم یاخود بەتانیەکی چاکە بەپێی ڕەگەزی مردووەکـە قوماشـی دەدرێ بەسـەردا (بۆ ژن سـورمەو بـۆ پیاو قوماشـی فاسـون)و* بـەجوانی دەیڕازێنێتـەوە. پاشـان دارە مەیتەکە سێ جار بەرز دەکرێتەوە بۆ گەردن ئـازادی بـۆ ئـەوەی ئـەجری دراوسـێی لەسەر نەمێنێ.

لـەناو کاکەیی‌یـەکانی ناوچـەی گـەرمیاندا وا بـاوە ئـەو کاتـەی تـەرمی مردووەکـە لەحەوشە دەهێننە دەرەوە سێ ناتێ بتوو ن بـەڕیزەوە لـەپێش تەرمەکـەدا دەنێـن، هۆی ئەنجام دانی ئەم کارە بەم شێوەیەیە:_

١- گوایە هەر مردوویەکە لەماڵ دەربکرێ لەغەیبەوە بەنهێنی سێ سـەگ بـەتاو دێن بۆ ئەوەی ئەم مردووە بخۆن. گوایە ئـەو نانانـە بـۆ ئەو سـەگانە واتـە هـەر سەگێکیان نـانێکە. سـەگەکان تـا خـەریکی نـان خـواردن دەبـن تـەرم لەحەوشـە دەردەچێ. هەرکە مردووەکە لەحەوشە دەرچوو ئیتر سـەگەکان حـەقی ئـەویان نی‌یەو ناکەونە دوای.

---

* ئەگەر مردووەکـە منـدڵ بێـت لـەناو دوو بـەرماڵدا دەی پێچنـەوە ویـەکێک هـەڵی دەگـرێ، کـاتێ کەمنداڵەکە هەڵ دەگرن دووجار بڵندی دەکەنەوەو لەسەر زەوی دایدەنێن بـۆ جاری سێیەم منداڵەکـە لەسەر باسکی هەڵ دەگرێ و رووەو لای باوکی منداڵەکەو خەڵکەکان دەچێ. پاشـان بـەرەو مزگـەوت و سەرقەبران. کە خەڵکەکە لەسەر قەبران دەگەڕێنەوە بەرەو ماڵی بـاوکی مردووەکـە دێـن و ڕووبـەڕووی ماڵەکە دەوەستن وئایـەتێک قورعانێ لەبـەر خۆیانـەوە دەخوێنـن و مـاڵی مردووەکـەش نـانێک دێننـە دەرەوەو ئەیدەن بەسەر پشتی باوکی منداڵەکەو پاشان وەری ئەگرنەوەو ئەیبەنەوە ماڵەوە.

* ئەو پارچە قوماشە بۆ قەبر هەڵکەن دەبێ.

* لەناوچەی خانەقیندا ئەگەر مردوو شەهید بوو کۆترێکی لەسەر جەنازەکـە دەبەسـتنەوەو مەیتەکـەش لەسەر دەست هەڵ دەگرن بەدەهۆڵ و زوڕنا مردووەکە بەرەو سەر قەبران دەبـەن ( ئەگـەر شـەهیدەکە گەنج و ژنی نەهێنابوو) لەگەڵ هۆتاف دانی ئایەتی (بـەر محەمـەدو ئالی بـەیتی محەمـەد سـەڵەوات) وێنـەی شـەهیدەکە لـەناو بازنەیـەکی گوڵرێـژدا دەیدەنـە دەسـتی لاوێـک و لەپێشـەوەی جەنازەکـەوە دەڕۆن. ئەم زانیاریانەم لەمامۆستا نەجم خالد ئەلوەنی) وەرگرتـووە، خـەڵکی خانەقینـەو مامۆسـتای زانکۆیە. ١٩٩٤/١١/٧).

٢- هەندێکیش دەڵێن: ئەم نان دانەی پێش تەرم لەبەر ئەوەیە تا مردووەکە چاوی خێری بەدوای خێزانەکەیوە بێت تا نەبێتە هۆی نان براویان. واتە چاوی بەدوای زەخیرەیانەوە نەبێت.*

## بەڕێ کردنی مردوو:-

پاش ڕێکخستنی دەستوری شۆردن وکفن کردن مردووەکە دەخرێتە ناو تابووت یاخود دارە مەیتێکەوە بەپێ ی دەستوری ئیسلام بەرەو مزگەوت ئەبرێ، وەلەم لاشەوە ژنان بەشین و شەپۆرەوە لەماڵەوە دینە دەرەوە* وەپیاوانیش بەرەو مزگەوت ئەکەونە ڕێ تا نوێژی جەنازە لەسەر مردووەکە بکرێ. ئەرکانی نوێژی مردوو حەوتن:

یەکەم: نی یەتی فەرزی نوێژی مردووەکە لەگەڵ (الله اكبر) دا.

دووەم: ڕوکنی دووەم چوار (الله اكبر). یانی دابەستنی نوێژەکە.

سێ یەم: ڕوکنی سێ یەم، خوێندنی سورەتی فاتیحەیە لەپاش (الله اكبر).

چوارەم: سەلاوەت دانە لەسەر حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) وسەلاوات لەسەر ئالی سوننەتە کەوابێ بڵێت:

اللهم صل على سيدنا محمد وعلى ال سيدنا محمد.

پێنجەم: دوعاکردن بۆ مردووەکە لەپاش (الله اكبر) کەئەبێ بڵێت:

(اللهم ارحمه، یا: اللهم اغفرله). دوعای مەشهووریش ئەمە یە بڵێت:

(اللهم اغفر لحينا و ميتنا و شاهدنا وغائبنا و ذكرنا وانثانا

---

* ئەم زانیارایانەم لەکاک هەردەویل کاکەیی ڕێکەوتی ١٩٨٩/٣/٦ وەرگرتووە.

* لە هەندێ ناوچەی کوردواری وباوە کەژنانیش لەگەڵ پیاواندا بەرەو سەرقەبران ئەکەونە ڕێ و لەسەرقەبران تامردووەکە ئەشارنەوە ژنان لەلایەک دائەنیشن و ئەلاوێنەوەو پاشان لەگەڵ پیاواندا هەڵدەستن.

اللهم من احييته منا فاحيه على الاسلام ومن توفيته منا فتوفه على الايمان)[1]

وەهەروەها هەرچی شەرتی نوێژەکانی‌ترە بۆ نوێژی مردوویش شەرتە، نوێژی مردوو سوونەتە بەجەماعەت بکرێ‌و جەنازەی مردووەکەش دەبێ لەپێشەوە دانرابێ پاش تەواوکردنی دابو دەستووری دادان مردووەکە بەرەو گۆڕستان بەڕێ ئەکرێ* لە هەندێ ناوچەدا واباوە بەتایبەتی ناوچەی خانەقین کە نەریتی (بەرجەنازە) یە ئەویش ئەوەیە کەسێ منداڵ بەسێ سەبەتەوە لەپێش تەرمەکەوە ئەڕوا ئەو سەبەتانە(نان) یاخود(نوقلی) لەناودایە. ئەو نان و نوقلانە بۆ منداڵەکان یاخود بەسەر هەژارەکاندا دابەش ئەکریت سەرباری ئەمانە لەناو کاکەیی کاندا جاران خیراتی پیش تەرم هەبوو. ئەم خیراتەی پیش تەرمە پیش ئەوەی تەرمەکەیان ببردایەتە سەر گۆڕستان چەندین ناسکە نان یان حەلوایان دەبردو لەپاش ناشتنی مردووەکە خەڵکەکە دەیان خوارد* لەناو کوردە شیعەکانیشدا (جەعفەری) لەخانەقین و مەندەلی‌و بەغدا و ئەو شوینانەی سەر بەم ڕیبازەن مردووەکانیان ئەبەن بۆ کەربەلا و نەجەف لەبەر ئەوەی شوینیکی پیرۆزە.

کەمردووەکە دەمرێ کوردەکان دەڕۆن بۆ (حسينيه) واتە مزگەوتی شیعەکان بۆ تابووت هینان. مردووەکە دەشۆن یاخود بەجل و بەرگی یەوە ئەیخەنە ناو تابووتەوەو بە ئوتومبیل لەگڵ خزم و کەس و کاری مردووەکە ئەیبەن بۆ کەربەلا و لەوێ ئەیشۆن و کفنی دەکەن. پاشان زیارەتی ئیمام (حوسین وعبباس) ی پێ

[1] بڕوانە: ڕیگای بەهەشت .... ل٣٦ _ ٣٨

* پیش ئەوەی مردووەکە بۆ گۆڕستان ببەن پیاوێک یاخود گۆڕهەڵکەن گۆڕەکە بۆ مردووەکە هەڵ دەکەنێ زۆر جاریش پیاوی تایبەتی هەیە کە (تەبرهەڵکەنی) پێ دەڵین. گۆڕهەڵکەندن لە زۆر ناوچەی کوردستاندا بەخۆڕایی یە، هەتاکو بەردو کیلەکانیش. بەڵام لەسلیمانی دا هەموو لەم چەند ساڵانەی دواییدا بووە بەپارە.

* ئەم زانیاریەم لەکاکە هەردەویل کاکەیی سەبارەت بەداب و نەریتی مردوو وەگرتووە لەڕیکەوتی ١٩٨٩/٣/٦.

دەکەن و لەکەربەلا وە بەرەو نەجەف دەبیەن و لەویش سێ جار بەدەوری مەرقەدی ئیمامی عەلی دا گری دەدەن وگۆڕی بۆ ئەکەن و ئەینیژن. گۆڕەکە لادەکەن واتە لەلاوە جەنازەکە لە گۆڕەکەدا دادەنین نەوەک لەناوەڕاستدا (ئەمە بە پیچەوانەی کوردە سونیەکانە) ئەگەر مردووەکە سەید بوو لەناو تاق لەمەرقەدی ئیمامی حسین دەی نیژن پاشان کەس و کاری مرووەکە بۆماڵەوە دەگەڕیننەوە و پرسەی بۆ دەگرنو لەچلەی و سەری ساڵدا دووبارە کەس وکاری مردووەکە بۆ نەجەف دەڕۆن و زیارەتی مردووەکان دەکەن.*

## دەستوری ناشتنی مردوو:-

کاتیک مردووەکە دەبەن بۆگۆڕستان دارە مەیتەکە بەسێ کەس یاخود چوارکەس هەڵ دەگرن. خۆ ئەگەر گۆڕستانەکە نزیک بێ ئەوە بەپێ خەڵکەکە دەڕۆن. ئەگەر گۆڕستانەکە دوور بێ بە ئوتومبیل مەیتەکە ئەبەن.

دەستوور وایە لە پیش خەڵکەوە تەرمەکە هەڵدەگیریت و مەلاو پیاوە بەساڵا چووەکان و خزم و کەس و کاری لەپیشەوە دەڕۆن، ئەمانە یەک لەیەکتری دارە مەیتەکە وەردەگریت و ئەیخاتە سەر شانی بۆ ئەوەی هیچ کەسێ ماندوو نەبێ و لەگەڵ وەرگتنی جەنازەکە دەڵین: (لا اله الا الله) یاخود دەڵین (یاواحد الله)، تا ئەگەنە سەر قەبران و جەنازەکە دائەنێن. ئەگەر قەبرەکە تەواو نەبووبێ ئەوە چاوەڕێ ی ئەکەن و خۆ ئەگەر تەواو بوو بوو ئەوا یەکسەر ئەیخەنە ناو گۆڕەکەوە.

لەکاتی ناشتنی مردووەکەدا ئەبێ ئەم کردارانە ئەو کەسانە بیکات کە نویژیان لەسەر مردووەکە کردووە یاخود دوو کەس نزیکی مردووەکە یەکیکیان بەپێ

* ئەم دەستوورو زانیاریانەم لەزاری سەید محەمەد شبر سالی ۱۹۸۰ وەرگرتووە ناوبراو تەمەنی (۷۰) ساڵە و نەخویندەوارە. خەڵکی نەجەفەو لەخانەقین دانیشتووەو سەیدی حوسەینی یە لەخانەقین.

خاوسی لەناو گۆڕەکەداو ئەڕەی تریان لە دەرەوە ئەم دەستوورە بەجێ دێنن و ئەو کەسانە ئەبێ جلێ بینن ڕیدەن بەسەر فەبرەکەدا تاکو مردووەکە جێگایەکی دەرنەکەوێ.

وەئەگەر مردووەکە ئافرەت بوو ئەوە ئەبێ کەسی یاخود میردی، براکەی،... باوکی، خوشکە زای بێ، دەڵێن بەپێ ی دەستووری ئیسلام بۆ ژنێ کەمێردی هەبێ مێردەکەی لەهەموو کەس چاترە بۆ دامێشتنی بۆناو قەبرەکە. سونەتە بۆ مردوو خشتی بخەنە ژێر سەری و ڕووی لە قیبلە بێ، هەروەها سوننەتە ئەوەی لە قەراغی قەبرەکەدا سێ مشت خۆل لەخۆلی گۆڕەکە هەلگرێ. بەسەر یەکەمیانا (منها خلقناکم) و بەسەر دووهەمیان (ومنها نعیدکم) و بەسەر سیهەمیانا (ومنها نخرجکم تارە اخری) بخوینێ لەپاشا ئەو مشتە خۆلانە یەکە یەکە بکاتە خوارەوە بۆ لای سەری مردووەکە پاشان یەکێ مشتێ خۆڵ هەڵ دەگرێ و حەوت جار سورەتی (انا انزلنا) ی بەسەر ئەخوینێ و بەسەر کفنەکەیا ئەکات ئینجا وردە وردە قەبرەکە بەخۆڵ پڕ دەکەنەوە وپاشان سەری قەبرەکە ئاو ڕشین ئەکرێ و جوان دەی کوتنەوە حەوت بەردی بچوک بەڕیزە لەسەر قەبرەکە دائەنرین ولای سەریەوە کێلێکی بۆدائەکوتێ* پاش داپۆشینی قەبرەکە ئیمام تەلقینی مردووەکە ئەکا بەم جۆرەکە خۆی دانیشێ و خەڵکەکەش بە پێیەوە ڕاوەستن و بڵێت (یاعبدا لله ابن امة ا لله اذکر العهد خرجت علیه من الدنیا، وهو شهادة ان لا اله الا ا لله وحده لاشریك لـه، وان محمد رسول ا لله وان الجنة حق، وان النار حق، وان البعث حق، وان الساعة انیة لاریب فیها، وان ا لله یبعث من القبور وانك رضیت با لله ربا، وبا الاسلام دینا، وبمحمد (ص) نبیا

* لەناو بگزادەکانی خانەقیندا واباو بووەکە مردووەکەیان بە تابووتەوە خستۆتە ناو قەبرەوە. ئەمەش نەریتی کوردەواری پێش چاخی ئیسلام دەردەخات.

ورسولا، وبالقرآن اماما و وبالكعبة قبلة والمومنين اخوانا ربي ا لله لا اله ان هو عليه توكلت وهو رب العرش العظيم).

سوننەتە ئەمە سێ جار دووبارە بکرێتەوە و پاش تەلقینەکەش خەلکەکە دوعا بۆ مردووەکە دەکەن.

## هەڵبەستن یا هەڵگرتنی گۆڕ:-

هەڵبەستنی گۆڕ ئەمەش لەڕۆژی حەوتەمدا یا چلە چەند کەسێکی خزم و کەس و کاری وناشنای مردووەکە لەگەڵ وەستایەک بۆ هەڵبەستنی گۆڕەکە بەرەو گۆڕستان دەڕۆن، کابرای مردوو ئەگەر هەژار بێت ئەوە بەخشت و قوڕ هەڵی ئەبەستن، بەلام ئەگەر هات و دەولەمەند بوو ئەوە بەکاشی ومەڕمەڕ لەگەڵ دانانی مێژووی لە دایک بوون و مردنی و نووسینی هەندێ شیعر و دانانی وێنەی مردووەکە ئەگەر گەنج بێت، هەندێ جاریش چەتری بۆ ئەکەن بەسەر قەبرەکە، لە ناوچەی خانەقین دا واباوە قەبری ژنان ( مدرج ) ئەبێت بەلام هی پیاو چوار گۆشە ئەبێت.

هەندێ بیرو باوەڕ کە پەیوندی بە دابی ناشتنی مردووەوە هەیە

١_ کاتێ کە مردووەکە دەخرێتە گۆڕەوە دەبێت پەڕۆکەی لای سەریەوە بکەیتەوەو بەسەر لادا دای نێیت و ڕوومەتی بخەیتە سەر بەردەکە چونکە دەڵێن (لەبەر ئەوەی خوا بەزەیی پیابێتەوەو وەک داماویک لەبەر دەمی خوادا ڕاوەستاوە ).

٢_ لەو کاتەی کە خۆڵی دەکرێ بەسەرا هەندێ خۆڵ هەڵ دەگرن و دووعا بەسەردا دەخوێنن... گوایە دەڵێن ( مرۆڤ بەهیچ چاوی پڕ نابێتەوە تەنها بەم مشتە خۆڵە نەبێت ) .

٣_ سێ کەس شەهادە دەدا کە ئەم مردووە کەسێکی باش بووەو خراپەی کەسی نەخواستووە، بۆ ئەوەی دڵی خەڵکەکەی لێ پاک بێتەوەو پاشان یەکێک لە خەڵکەکە هەڵ دەستێ دەڵێ: (خەڵکینە ئەم پیاوە چۆن پیاوێک بوو؟ خەڵکەکە ئەڵێن پیاوێکی چاک بووە ئەمجا ئەڵێ کەواتە گەردەنی ئازاد کەن) ئەوانیش ئەڵێن (گەردەنی خۆش وئازاد بێ) پاشان یەکێک لە پیاوە ئایینیەکان نەختێ خۆڵ لە گۆڕەکە هەڵ ئەگرێ و سورەتی (تبارک) ی بەسەر ئەخوێنی و پاشان ئەیکاتە ناو قەبرەکەوە.[١]

٤_ دوای تەلقین* دانی مردووەکە دەڵێن دوومەلائیکە (فریشتە) دێنە لایەوەو پرسیاری لێ دەکەن و پێ ی دەڵێن: خوات کێ یە؟ پیغەمبەرت کێ یە؟ ئیمانت چی یە؟ ئاینت چی یە؟ قیبلەت کوێ یە، خوشک و برات کێن؟ لەئەنجامدا دەڵێ (ئەللە هو ڕەبی، پیغەمبەرم محەمەدە، پیشەوام قورعانە، ئایینم ئیسلامە، ڕووکەم کەعبەیە، خوشک و برام فلانە.

دەڵێن ئەگەر موسلمانێکی باوەڕ پێکراو باش بێت ئەوە بەتەواوی وەلامی پرسیارەکان دەداتەوە. ئەگینا زمان و دەمی تێک دەئاڵێ وناتوانێ وەلام بداتەوە، پاش تەلقین یەکێک هەڵدەستێ و دەڵێ:

(خەڵکینە خواخیرتان بنوسێت و ڕەحمەتی خواتان لێ بێ) و پاشان بەرەو ماڵی مردووەکە دەگەڕێتەوەو سەرە خۆشی لەکەس و کاری مردووەکە دەکەن و دەڵێن: (خۆت سەلامەت بی، عومری درێژی بۆ ئەوانەی بەجێ هیشت، ئەمە ئاخر خەمتان بێ).

---

[١] علاءالدین سجادی _ کوردەواری _بەغدا _ ١٩٧٢، ل٣٣

* لەناوچەی بادینان دوای تەلقین خویندن تا هەفتە یەک ئەو قەبرە بەشەش لەقێ دەگرن و بەنۆرە شەو و ڕۆژ بەدوای مردووەکەوەن تا شەوی هەینی.

٥_ له نه‌ریتی کورده‌واری دا وابـاوه ئـه‌و شـوینه‌ی مـردووی لـێ شـۆرا بـه‌شـه‌و تـا به‌یانی تا پرسه‌که ته‌واو ده‌بێ فانۆسێک یاخود گلۆپێک له‌سه‌ری‌دا ئه‌گیرسێنێ.

## ده‌ستووری پرسه دانان:-

به‌گشتی پرسه سێ ڕۆژه‌و له‌هندێ ناوچـه‌ی کـورده‌واری حـه‌وت یـاخود پێنـج ڕۆژ ده‌خایه‌نێ* و تادوو ساڵ تازیه ناپه‌وێته‌وه.

له‌ماوه‌ی تازیه‌دا که‌سی مردووه‌که تا ئه‌م سـالانه‌ی دوایـش نـاچن بـۆ هیـچ مـاڵێک مه‌گه‌ر بۆ پرسه نه‌بێ. ئافره‌ت به‌رگی ڕه‌ش ده‌پۆشێ‌و ڕێکه‌وت ئه‌گه‌ر پاش ماویه‌کی تازیه‌که کچێکیـان بـه‌بووکی بگوێزرێتـه‌وه ئـه‌وه بـه‌جلکی ڕه‌ش و بـێ ده‌نگـی ئه‌یگوێزنه‌وه.

ئافره‌تیش تـا چـه‌ند سـاڵێک ڕۆژانی هـه‌ینی سـه‌ر له‌قـه‌بری منداڵـه‌کانی یـاخود که‌سه‌که‌ی ده‌دات.

## پرسه (ته‌عزێ):-

به‌گشتی پرسه‌ی کوردی‌و ده‌ستوری پرسه دانان دوو جۆره:

١. ته‌عزیه‌ی پیاوان.

* پاش به‌جێ هێنانی مه‌راسیمی شارتنه‌وه خه‌ڵکه‌که تێکرا بۆ به‌رده‌م ماڵه مردووه‌که ده‌گه‌ڕێنـه‌وه‌و له‌وێ مه‌لاو خه‌ڵکه‌که چه‌ند ئایه‌تیکی کـورت به‌سـه‌رپێ وه ده‌خوێنـن ئه‌گـه‌ر مردووه‌که‌یان منـداڵ بێـت نانێک دێنن ئه‌یخه‌نه پشتی باوکی منداڵه‌که. شـایه‌نی باسـه لـه ده‌شـتی هـه‌ولێر پیـاوانیش وه‌کـو ژنـان جۆره سه‌ردولکه‌یه‌کی تایبه‌تی هه‌یه که پیش چل ساڵ له ئارادا بووه‌و ئه‌لله‌یان بـه‌پیوه ده‌به‌سـت و به‌گریانه‌وه (بابه‌ڕۆ, براڕۆ, ئاغا ڕۆ) یان ده‌کرد. پیـاوان تـا حه‌فته‌یـه‌ک ڕدیـن یـاخود ڕیـش ناتاشـن, تاماوه‌یه‌ک خۆی ناشوات و جلو به‌رگی ناگۆڕیت.

(پاش کوژانـه‌وه‌ی شۆرشـی سمکۆی شـکاک _ سـوار چاکـه‌کانی به‌سـه‌ر گونده‌کاندا دابـه‌ش بـوون و هه‌ندیکیان له گوندی (پیر ڕه‌ش) ی ده‌شتی هه‌ولێر بوون و شینیان ده‌کرد به (بابه ڕۆ) و فه‌قیانه یان ئه‌نکوچکیان له (خوم) ده‌نا (ئه‌م زانیاریه‌م له (طارق جامباز) ساڵی ١٩٨٩ له‌هه‌ولێر وه‌رگرتووه.

٢. تەعزیەی ژنان.

١_ تەعزیەی پیاوان: پاش گەڕانەوەی پیاوان لەسەر قەبران، پیاوان دەست بەدانیشتن دەگەن ئەمەش چ لەماڵەوەدا بێ یاخود لەمزگەوتدا. جاران تەعزیەی پیاوان سێ ڕۆژ بووەبەڵام ئەمڕۆ لەشارەکاندا دوو ڕۆژە* مەلا بانگ ئەکرێ بۆ ئەوەی قورئان بخوێنێو خێر بەمردووەکە بگات. پاش هەر قورئانێک فاتحایەک ئەخوێندرێ* مەلا یاخود یەکێک لەناو تازیەکەدا هاوار دەکات (الفاتحە). لەتازیەی پیاواندا کەسوکاری |مردووەکە بەپێوە ڕاوەستن و بەخێرهاتنی خەڵک دەکەن. بەڵام لەناوچەی بادینان پیاوان دادەنیشن و لەجێی خۆیان هەڵ ناستن. پاش دوو ڕۆژ یاخود سێ ڕۆژ لەلایەن هەندێ کەسو دۆست و برادەرانی تازێکەوە پیاوان لەمزگەوت هەڵ دەسێنن و ڕیشیان پێ دەتاشن. پاشان پیاوان ڕوو لەماڵەوە دەکەن و ئەو دۆست و ناسیاوانەی کەنەیانزانیوە دیدەنی ماڵەوەیان دەکەن. ئەم دانیشتن و بەسەر کردنەوە زۆرجار لەکوردەواریدا پتر لەچل ڕۆژ دەخایەنێ[٧] بەتایبەتی ئەوانەی ناودارین.

---

* زۆرجار دەڵێن دانانی تەعزیەی پیاوان لەفلان مزگەوتە یاخود لەفلان شوێنە بەمە خەڵکەکە ئەزانێ لەکوێ بۆی دانیشتن، لەکۆندا پیاوان سێ ڕۆژ لەمزگەوتدا دادەنیشتن و ئاوو چاوو قاوەی تاڵیان دەگێڕا، بەڵام لەمزگەوتەکانی شاری سلێمانی عەسران پیاوان دوو سەعاتدادەنیشننائو چا دەگێڕن، بەڵام لەلادێو شارەکاندا سێ ڕۆژ بۆ پیاوان دادەنیشن.
ئەم دەستورە بۆ یەکەم جار لەپرسەی ئەحمەد مەعرووف بابان پەیڕەو کرا کەجگەرەکانیان گەڕانەوەو بڕیار درا چاوو قاوە نەگێڕدرێ.
* لەناو تەعزیەکەدا چ تەعزیەی پیاوان یاخود ژنان بێ چەندەها ئامۆژگاری لەلایەن مەلاو بەساڵا چووەکان دەوترێ. وەکو:
(لاتدري نفس ماذا تكسب غدا ولاتدري نفس بأي أرض تموت)
واتە کەس نازانێ سبەی چی دەبێت و نازانی لەچ خاکێکدا دەمرێت یاخود: كل نفس ذائقة الموت.
(هەموو کەسێک ئەبێ مردن بچێژێ یا چارەنووسی مردنە).
یا:
(قبر حفر من حفرة النيران او حفرة من حفرة الجنان).
واتە: (گۆڕ چاڵێکە لەچاڵەکانە دۆزەخ یا چاڵێکە لەچاڵەکانی بەهەشت).

**یاخـــود:**

زعم الذين كفروا ان لن يبعثوا قل بلى وربي لتبعثن ثم لتنبأونّ بما علمتم وذلك علي ا لله يسير.
واتە نامسولمانەکان دەڵێن زیندوو بوونەوە نیە خواش بەپێغەمبەر (د.خ) دەڵێت بلێ خودا زیندوتان دەکاتەوەو ئاگادارتان دەکات بەوەی کردووتانە ئەم ئایەت و ئامۆژگاریانە هەمووی بۆ دڵدانەوەی خاوەن تەعزیەکەو دانیشتوانی ناو تازیەکەیە کە خەڵکی لەقسەی پڕو پوچ دوور دەکەوێتەوەو هەموویان خێری گوێ گرتنیان لەقورئان و حەدیس دەست دەکەوێو دەرس و ئامۆژگاری لێ وەردەگرن.

# ٢- پرسە (تازیەی ژنان)

پرسەی ژنان لەماڵە مردووەکە ئەکرێت. هەموو ئافرەتانی دەورو پشتو کەسو کار لەوێ کۆئەبنەوەو شینو شەپۆڕو واوەیلاوو لەخۆدان دەست پێ ئەکات وشەو دەستەواژەی لەم جۆرانە لەزاریان نابڕێت کە بەپێی ناوچەکانی کوردەواری ئەوترێت وەک (ڕۆڵە ڕۆیە) و (هەی وای شێرە) و (زاوا ڕۆیە)، (کزەی جەرگم.....هتد).

چەند ساڵێک لەمەوبەر ژنان بۆ مردووی نزیکیان خۆیان لە قوڕ ئەپیراو قوڕیان بەناو چاوانیان ئەدا. بەشێوەیەکی وا دەمو چاوی خۆیان بریندار دەکرد کە خوێن بە ڕوومەتیان دەهاتە خوارەوە. ئەگەر مردووەکە لاو یاخود گەنج بێت ئەوە وێنەو جلە جوانەکانی دادەنێنو بەرامبەری شین دەکەن. لەتەعزیەی ژنان دا جگەرەو ئاو ئەکێڕن، ژنێکیش بەپارە ئەگرن کە بلاوێنێتەوە وەمەلایەکیش بانگ دەکرێ کەقورعان بخوێنێ بەپێی توانای ماڵە تەعزیەکە لە زۆر ماڵاندا بەتایبەتی (سلێمانی) واباوە (سێ ژن) بەپارە دەگیرێو دەف لێ دەدەنو فەرمودەی پێغەمبەرو مەدحی پێغەمبەر بەدەفەوە دەڵێن... پاش وەستانیان ژنان دەست دەکەنەوە بەشین و شەپۆڕو هەڵسان بەپێوەو یەکێک (زاوا ڕۆیە) یا (بوکێ ڕۆیە) دەکاتو ئەوانی تریش بۆی دەسێننەوەو یاخود (وەی وەی شێرە) من خۆم لەساڵی ١٩٨٧ دا لەیەکەم ڕۆژی نەورۆزدا ئەم دەستورەم بەجێ هێنا بەهۆی مردنی جوانە مەرگی خوشکمەوە (بدریە) ئاگر لەدڵو دەرونم هەڵدەستاو ئۆقرەم لەبەر برابوو، هەرچی دەهات، یا بۆ جوانە مەرگ شینی دەگێڕا یاخود بۆ مردووی خۆیو تازیەکە تازە دەبۆوە چەندەها شیعری جۆراو جۆری تایبەت بەمردوو دەوترا. ئێستا شینو لاوانەوەو پرسەدانان وا زۆر بووە کەم کەس پێویستی بە (لاوێنەر) هەیە.

لەشاری هەولێردا ئەم نەریتە دووجۆرە لە ماڵە هەولێریە کۆنەکاندا ئافرەتێک بانگ دەکەن کە قورعان بخوێنێو جار جاریش بەکوردی یاخود بەتورکی ئامۆژگاری خەڵکەکە دەکاتو خەڵکەکە لەبەر خۆیانەوە شین دەکەن.

بەلاّم جۆرەکـەی تـر لەلایـەن ئەوانەوەیـە کەلـەگوندو شـارۆچکەکانی هـەولێرەوە هاتوونو نەریتی خێلّیان تیاماوەو تازیەکە زۆر گـەرم دەبیّو لـەخۆ دەدەنو قـژ لیّ دەکەنەوەو بەدەوری باسکیاندا قژەکان دەبیەستنەوەو پاش ڕۆژێک ژنێک بەمەقەس قژەکان دەبڕیّو لەدەسو باسکی دەکەنەوە.

ـ لەناوچەی بادینان پرسە دانان وەکـو شـوێنەکانی تـر نیـیە لێرەدا ژنـان سـەرو پرچی خۆیان ناڕننو خۆیان لەقوڕ ناگرن بەلّکو هێمنانەو لەسەرخۆ دەگریـن چونکـە بەلایانەوە ئاینی ئیسلام ڕێگەی نەداوە سەرو پرچیان لەقوڕ بگرن.

ئـەوەی جیـیّ سـەرنجە لەتازیـەدا خزمـی نزیکـی مردووەکـە (دایـک ـخوشـک ـپـووری) شـین دەکـەنو قسـەکانی مردووەکـە دووبـارە ئەلّێنـەوەو ئـەوانی تریـش لەسەرخۆ فرمێسک ئەڕێژن هەندیّ جار دایک یا خوشکی مردووەکـە دەنگی گریـانی بـەرز ئەبێتـەوەو لـەژووری پیاوانـەوە بـاوک یـاخود براکـەی گریانەکـەی بیّدەنـگ کردووەو وتویەتی ئەگـەر تـۆ ڕاسـت دەکـەی تـۆ دایکـی ئەویو موسـلمانیو خۆشـت دەویّو وای بۆ ناکەیو فاتیحەی بۆ ئەخوێنی.

ئەگەر ئەمە دەستووری بادینانە لـەناو زۆر لـەهۆزو تیرەکـانی کـوردەواری ژنـان پرچیـان دەڕنـەوەو لەباسـکی خۆیـان دەپێچـن بەگشـتی تازیـەی ژنـان سـیّ ڕۆژەو لەهەندیّ شوێندا پێنج ڕۆژە یا حەوت ڕۆژە یا دە ڕۆژە، ڕۆژی سێیەم ژنان دەچن بۆ سـەرقەبرانو لـەویّ شـینو شـەپۆرو لاوانـەوە دەسـت پـیّ دەکاتـەوەو مـەلا قورئـان دەخوێنـیّو ئامۆژگـاری خـەلّکان دەکـاتو باسـی عـەزابی قـەبرو زینـدوو بوونـەوە دەکاتو خەکلەکە هەلّدەسێنیّو نایەلّی لەدوای مەلا کەسی مردووەکە بگرین چونکـە گەورەیی قورعانو فەرموودەکان ناگات بە مردووەکـە ئەگـەر گریـان. دوای سـیّ ڕۆژ یاخود حەوت ڕۆژ ژنـان کـە گەڕانـەوە لەسـەر قـەبران حـەلوا یـاخود خورمـا بەسـەر دراوسێیەکاندا دابەش دەکەن.

ژنان هەموو هەفتەی جارێک یادووجار دەچنـە سـەر قـەبران، زۆرجـاریش دایکـی مردووەکە هەموو ڕۆژێک تاچلەسەر لەمردووەکە دەدات.

لە کـوردەواریدا واباوە بـەپێی دەسـت ڕۆیشـتووی مالّـە مردووەکـە تـا سـالّێک یاخود ئەگەر هەژار بیّ تا چلەی ئێواران خواردن بۆ مالّـە هـەژاریّ یـا مەزگـەوت بـە خێری مردووەکـە دەنێریّ. لەچلـەیدا دووبـارە بـۆ مردووەکـە دادەنیشـنو شـین و

لاوانەوە دەست پێ دەکا بەڵام دەربارەی پرسە گرتنیش کەس‌و کاری مردووەکە لەساڵێکەوە تا دووساڵ هەندێ هۆزیش تا پێنج ساڵ جلکی ڕەش لەبەر دەکەن ژنانیش لەو ماوەیەدا زێڕو خشڵدا ئەکەن* لەناوچەی بادینان تەعزیەدار جلکی ڕەش لەبەر ناکەن بەڵکو شین لەبەر دەکەن.

## چۆنیەتی ئامادەکردنی خواردن لەماڵە مردوودا:-

لەکوردەواریدا بەگشتی واباوە کە بۆ ماڵە تازیە زۆر کەس لەگەڵ خۆیاندا ڕۆن، برنج، شەکر، دۆشاوی تەماتە یاخود چا کاورێک لەگەڵ خۆیاندا دەبەن، هەندێکیش پارە بەساحێب مردووەکە دەدات.. زۆر جار یەکێک لەکەسانی مردووەکە ناوی ئەوانە دەنووسن کە ئەم شتانەو پارەیەی داوەو هێناویانە.

ئەوەی کە جێی سەرنجە دانیشتوانی کۆیەو بادینان‌و تارادەیەک هەولێرو خۆشناوەتی‌وگەلێ شوێنی تر ئەوەیە کە تازیەدار خۆیان خواردن دروست ناکەن، بەڵکو لەماڵە دراوسێکانیانەوە بۆیان دێنن‌و ئەمە لەسێ ڕۆژەوە تاحەفتەیەک دەخایەنێ‌و ماڵەمردوو مەنجەڵ ناخەنە سەر ئاگرو خواردن دروست ناکات، (لەبەر ئەوەی خاوەن مردوو جگەر سووتاوو دڵ بریندارو بەخەمن) ئەوەی لە شاری کۆیەدا ڕەچاو دەکرێ ئەوەیە کە لەم شوێنەدا مەراسیم یاخود دابی سفرە بردن هەیەو جۆرە دەستەواییەک لە بەینی دانیشتوانی شاری کۆیەدا هەیە کە پێی دەڵێن (سفرە بردنەوە) واتە هەر ماڵێک مردووی لێ مرد هەتا هەفتەیەک سفرەیان بۆ دەچێتەوە.

## سفرە:-

بریتی یە لەسینی یەک کە ڕازابێتەوە بە دوو بەلەم قەلایەچن کراو بەپلاو برنج‌و یەک مەنجەڵ شلە (ترش) لەگەڵ دوونان هەر نانێکیش دەکرێ بەدووپارچە، پارچەیێکیان لەژێر بەلەمە برنجەکەو ئەوی تریش لەسەر بەلەمەکە دادەنێن. هەر ماڵێک ئەو سینیەی تێدا بەو جۆرەی سەرەوە دەرازێنێیەوە، یەکێک لەکەسی ماڵەکە

---

* لە دەشتی هەولێر واباوە کە ژنان ئەگەر تازیەیان هەبێ، نابێ برێشکە بخۆن‌و شتومەکی سپی‌و ڕنگاو ڕەنگ لەبەربکەن، هەروەها بازنەی زێڕو زیویش لە دەستیان دائەکەن.

دەچێ لەناو تازیەکەدا دادەنیشێو نان دەخوات. یان پیاوی ماڵە خاوەن سفرەکە دەچێتە ناو پیاوانو لەگەڵیان نان دەخوات هەروەک وتمان کەسی نزیکی مردووەکە تەرخان کراوە بۆ ئەوانەی کە سفرە دێنن‌و یەک لەدوای یەک وەری دەگرن‌و یەکێکیش قەلەمی بەدەستەوەیە ناوی ئەو ماڵانە دەنووسێ کەسفرەیان بۆ ناردووە ئەمەش لەبەر دوو هۆ:

١_ وەک وتراوە: (شینو شایی دەستەوایی) وە بۆ ڕۆژی خۆی بەشداری ئەم ماڵەی لەشینو خۆشیدا کردووە.

٢_ تاکو بیریان نەچێت چ ماڵێک سفرەی ناردووە تاکو سفرەو سنییەکە بۆ ماڵەکە بنێرنەوە. بەگشتی ژمارەی ئەو سینیو سفرانەی کەدەنێرن بۆ ماڵی مردوو بەپێی دەستەوایی ئەو ماڵە مردووە دەگۆڕێ.

هەروەها لەم شارەدا بۆ ژەمی ئێوارەش دیسان ژمارەیەکی زۆر سفرە دێتەوەو سفرەی ئێوارانیش لەپێش بانگی (مەغریب) زۆرجار سفرە خۆی ئەدا لەسەد سفرە یان زیاتر بەم جۆرە ماڵە مردوو لەکۆیەو شوێنانی کەباسمان کرد پارە سەرف ناکەن.

بەلام لەشاری سلێمانیدا ئەوەندەی کەئاگاداربم کەس سفرە نابات بۆ ماڵە مردووەکە بەڵکو ماڵە مردووەکە لەگەڵ ئەوەی کۆستێکی گەورەی لێ دەکەوێ، دەکەوێتە ژێر باڵی قەرزیشەوە ئەوەش ئەوەیە کەئەو سێ ڕۆژەی تازە ماڵی مردووەکە بەهەلاکەت دەچن.

* لەماڵە مردووەکە کەسی مردووەکە یادراوسێیەک یا ئافرەتێ بەپارە دەگیرێو چێشت لێ دەنێن. چێشت کردن لەسلێمانی بەپێی داراییو دەستڕۆیی خاوەن مردووەکەیە ئەگەر دەوڵەمەندبن خواردنو خواردەمەنی چاک دروست دەکرێ بەتایبەتی نیوەڕوانو ئێوارانو ئافرەت گرتن بۆ لاوانەوەش بەپارەیە، مەلا بەپارەیەو

* لەهەندێ گوندی سەر بەشاری هەولێر (شیوە غەریبە) هەیەکەیەکێک لەناودارانی گوندەکە خواردن بۆ کەسو کاری مردووەکەو ئەوانەی مردووەکەیان بەخاک سپاردووە دروست دەکەن.

خەتم کردنی سێ ڕۆژەش بۆ مردووەکە هەر بەپارەیە. کەواتە، راستان وتووە (ماڵە مردوو سەریشی ئەڕواوماڵیشی).

## کارتێکردنی ئاینی ئیسلام بەداب و نەریتی پرسەو پرسەگردا:-

گومان لەوە دانییە کەئاینی ئیسلام شۆڕشێکی گەورەی بەسەر دابونەریت بووەو بۆتە هۆی گۆڕانی زۆر لایەنی ژیان چ لەڕووی رامیاری، ئابووری، کۆمەلایەتی یاخود ئاینی بێ.

ئەوەی کەجێی سەرنجە لەئاینی ئیسلامدا ئەوە ڕوون بۆتەوە کەئیسلام لەخۆدانو قوڕ پێوانی قەدەغە کردووە بەلام لاوانەوەی قەدەغە نەکردووە، هەروەک دکتۆر عەبدولحەلیم حەنەفی دەلێ (ئیسلام نەهی لەخۆدانو قوڕ پیوانی کردووە بەلام لەو قسانەی کەبەسەر مردووەکەدا ئەکرێ چ بەشێوەی شیعر وتن بێ یاخود پەخشان نەهی نەکردووەو هەروەها ئەوەی ڕوون کردۆتەوەو کە:-

لاوانەوە بەشێوەی سەرزاری وتنی بەهونەرێک لەئەدەبی میللی دادەنێو دەلێ ئەمە دیاردەیەکی کۆمەلایەتیو مێژوویییەو لەئەنجامی هەلوێستێکی ناخۆشی پڕ دروست دەبێو مەبەستی دانانی تەعزیەش هانی خەلکو کەسو کار دەدات کەیادی ئێشو ئازارو گریان بکاتەوە.

# بەشەکانی شینو لاوانەوە

هەر لەکۆنەوە لاوانەوە کراوە بەدوو بەشی سەرەکییەوە:-

**١_ لاوانەوەی تایبەتی.**

**٢_ لاوانەوەی گشتی.**

١_ لاوانەوەی تایبەتی ئەم جۆرە لاوانەوەیە نزیکترین کەسی مردووەکە ئەگرێتەوە. وەک کەسانی خێزان باوک، دایک، خوشک، برا، مندال، هاوڕێو خزمو

كەسوكار، هۆزو تیرە. ئەمەش گەورەترین بەشی لاوانەوەی كۆمەلایەتی‌یە[1].

ئەم جۆرە لاوانەوەیە بەم جۆرە كەمرۆڤ سۆزو هەستی خۆی بەهۆی پەیوەندیەكانی بەهێزی خوێنو گیانی دەربڕی، لێرەدا چارەنووسی كەسانی خێزان یەكێ بەدوای ئەوی ترەوەیە بەهۆی خۆشەویستی‌و سۆزێكی كاریگەرێ هۆكریاندا لەژیان بەیەكەوە بەستراوە.

ئەم جۆرە لاوانەوەیە یەكەم لەئەدەبی فۆكلۆری‌و پاشان ئەدەبی نووسراودا گرنگی پێ دراوە.

لەم بەشەدا هەوڵ ئەدەین لەلاوانەوەی تایبەتی فولكلۆر بدوێینو پاشان شیعری شینو لاوانەوە لەبەرهەمی شاعیران بەپێی جیاكانی‌و مێژووی سەرهەڵدانی بكەین (بەشی دووەم).

## جۆرەكانی شینو لاوانەوەی فۆلكلۆری كوردی:-

جۆرەكانی شینو لاوانەوە (سەردولكە)* كەبەئاوازێكی دڵتەزێنەوە دەگوترێ بەگشتی‌ی شینی پیاوانو شینی ژنان ئەم جۆرانەی خوارەوە دەگرێتەوە.

١_ شینی بووكانە بووكانە (بووكانە رێ بووكێ).

٢_ شینی مەمكی نازداری.

٣_ شینی قۆشەن.

٤_ شینی دیوانی‌و دیوەخانی.

٥_ شینی شانەشین.

٦_ شینی هیری هیری.

٧_ شینی سەیدەم.

٨_ شینی قەڵغانو شمشێر.

---

[1] الرثاء – سلسلة فنون الادب العربي – بأشراف الدكتور شوقي حنيف، ص١٧.

* جگە لەم جۆرە شینانە جۆرە شینێكی تر هەیە كەتایبەتن بەشەڕو ڕووداوی بوومەلەرزەو لافاوو گوندتێكدانو گرتنو زیندانو سووتاندنیماڵو ئەنفالو دوورخستنەوەو كۆرەوی‌و ئاگریەربوون لەخەرمان.

٩_ شینی لاوژۆیان‌و لاوژۆکە.

١٠_ شینی کەوەکم دەوێ.

١١- شینی کۆمەڵ.

١٢_ شینی لۆم برێنە شاهی ماری.

١٣_ شینی وای وای واوەیلێ.

١٤_ شینی کەسم نەما.

١٥_ شینی ڕۆڵە ڕۆ ( بۆ منالان ).

١٦_ شینی هەی ڕۆ، هەی ڕۆ ڕۆ لەگەرمیان زیاتر.

١٧_ شینی های مەمۆ.

١٨_ شینی کابانی لاڕێ لاڕێ.

١٩_ ئاغام ڕۆ وەی ڕۆ گیانم ڕۆ وەی ڕۆ (لەناو جافەکان).

٢٠_ هەی وا هەی وا واشێرە (لەگەرمیاندا).

# شینی تایبەتی

## شینی ژنان

١_ شیوەنی دایك خۆبەخۆی بەنەمانی نزیكترین كەسی كەجگەر گۆشەكان و مێردو كەسو كاری بوون ئەم جۆرە شینە بەناوی (شینی كەسم نەما ) كەدەڵێن:-

كەسم نەما كەسی كەسان
كەسم نەما لەمەجلیسان
كەسم نەما بكا قسان

٢_ شیوەن بۆ مناڵ.
٣_ شیوەن بۆ باوك.
٤_ شیوەن بۆ دایك.
٥_ شیوەن بۆ برا، خوشكو كیژی گەنج.
٦_شیوەن بۆ هاورێ.
٧_ شیوەن بۆ ژنی جوامێر.
٨_ شیوەن بۆ غەریبی.

**٢- شیوەنی دایك بۆ منداڵەكەی.**

منداڵ لای دایكو باوك كۆرپەیەكی بەنازو خۆشەویستە، فریشتەی ناو ماڵەو هێلانەی خۆشیو بەختەوەری نێوان خێزانە. دایكو باوك كە جگەر گۆشەی نەخۆش ئەكەوێ لێی دوور ئەكەوێتەوە كەمو كورپەكی ئەبێ بەمە دڵ گران ئەبێو جەرگی وەك كەباب ئاسایی لێ دێ.
دایك حەز دەكات هەموو خۆشی خۆی لەخۆشی منداڵەكانیدا بتوێنێتەوە، گەرماو ساردی ژیانی لەخۆشی منداڵەكانیدا ئەبینێ. هەمیشە دەستی بەنازی بەمنداڵەوەیە خزمەتو پەروەردەی ئەكاتو نازو نیعمەتی ئەكێشێ، بەڵام ئەگەر لەپڕ ئەو منداڵە

لەباوەشی دایکی جیا بۆوە دایک خەم دای ئەگرێو خەمبار ئەبێ و هەموو هەستو ئارەزووەکانیو هیواو یادگارەکانی بەفرمێسک بۆ ڕۆڵەکەی دەر ئەبڕێو فرمێسکی بەکوڵ، بەدەنگێکی بەسۆز ئەلاوێنێتەوە، بەتایبەتی کاتێ کە دەزانێ جێگەی چوڵ ئەبێتو مردنەکە ئەبێتە چاوگی ناسۆرو ژان بۆ کەسو کاری بۆیە دەڵێ:

کۆچی دوایت کرد ڕۆڵەی داماوم
ڕوناکی دڵو هێزو هەناوم

منیش لە دوای تۆ هەتاکو ماوم
نابێ وشکی کەم فرمێسکی چاوم[1]

مردووەکەش کاتێ دایکی ئەبینێت بەکوڵ بۆ جگەرەکەی دەگری لەسەر زاری لاوێنەوە بەدایکی ئەڵێ:

دایە گیان مەگری مەم لاوێنەوە
ئەگەرچی مردن داخی گرانە
نزایە بکە بپارێزەوە
چونکە ئەم شوێنە بۆ هەموانە

ئەمە لەلایەک لەلایەکی ترەوە مردووەکە پەستو پەشۆکاوە بەتایبەتی کەباوکو دایکی بەم شێوەیە ئەبینێت وەک جیهانی بەسەرا ڕمابێت، ڕووی دەمی تێ ئەکاو ئەڵێ:
بابە من هیوای تۆ بووم پێ بگەم
تا ئەرکی سەرشانت تۆزێ سووک بکەم

---

[1] هیوا عمر _ هۆنراوەی فۆلکلۆری لاوانەوە _ هاوکاری، بەغدا ١٩٧٩

یاخود لەناوچەی خانەقین کاتێ کەژنێک منالی ئەمرێ بەم شێوەیە کۆرپەکەی ئەلاوێنێتەوە*

ڕۆڵە خودا نەکرد بەو وەگیاند بود
هەزاری وەک دایکد وەقوریاند بود

ڕۆڵە خودا نەکەد گل وەباند بود
لەژێر ئەو گلە گوڵ سەیواند بود

ڕۆڵە (مەگێلیا) هەردەوە هەردە
وێتەی ئاهووان وێلە گوم کەردە

ڕۆڵە دەرددت بکەوت لە خوزم چون قەس لیوە
وەکو چاو گل کەران گر بخزم وەپێوەد

ڕۆڵە مەچوو مەچوو تابگەم وەپید
مەمک ووشکم تابدەم وەپید

ڕۆڵە من چەوەتم توچە شنە وەتی
شەقە دای لەبال لەلیم دویر کەفتی

ئاسکە زەرینە مل وەزەرەوە
ڕوڵە چوین قەرار دگرد لەژێر بەرەوە

---

* ئەم لاوانەوەی تایبەت بەناوچەی خانەقین لەزاری (لەیلا خانی کچی ساڵحی بەیرام) وەرگرتووە. تەمەنی (٨٠) ساڵەو لە گەڕەکی (حي البعث) ساڵی (١٩٨٠) لەزاری وەرگرتووە.

ڕۆڵە لاوە لاوە تەواو بکەم هامە لاتەوە
فریشتەی خەیران هاوەلاتەوە

یاخود لەکاتی کفن کردنی منداڵەکە وەپێش ئەوەی بیبەن بۆ سەر قەبران دایک ئەلاوێنێتەوە ڕوو ئەکاتە منداڵەکەی و پێی ئەڵێ:ـ

مەچوو مەچوو ڕۆڵە تاگل بکردام
وورده رازا نەگەی دایگد ئەراد بکردام

ڕۆڵەناکامم، ڕۆڵەی تێر لە دنیا نەخواردیم
ڕۆڵەی عەزیزم

ڕۆڵە مەچوو وەناو ئەو قەورە، ئەو قەورە تەنگە
کوڕ مەردم کە نیەی وەزەردە خەنە

ڕۆڵە لەدەردا بەوینم بێژە دایە
ڕەنج چەند ساڵەم مەدە وەزایە

ڕۆڵە بەدبەختی بەختم پەخشەن لەعالەم
سەبر بی جەخت مەیو لە تالەم

ڕۆڵە تۆ لەدەردا بەو خاتر بکەم شای
خەم بەد بەختی دایک بینمەی وەبای

یا لە دوای هەفتەی ژنان ڕوو ئەکەنە سەر قەبرانو دایکی منداڵەکە دەست ئەکات بەگریان..

ڕۆڵە ئەم شەو چەن شەوە مار لەجێگام بود
ئەخۆد پەلامارد بوو، نەویم راگەم بود

دوای ئەوە ژنان بەدایکی منداڵەکە ئەڵێن کە گریان کەم کاتەوە دایکە لەم کاتەدا ئەڵێ:_

مەگیر مەگیر گیریانە بەسە
بادایکی بەد بەختد بگیر حەقی بەدەستە

ئەمەش لاوانەوەیەکە بۆ یەکێکە لەمنداڵەکان :

ڕێ یە باریکەی لۆ کۆیە دەچێ
دەستو جانتاکەی لە (فلان) دەچێ

ڕێ یە باریکەی لۆ بەغدا دەچێ
بەژنە جوانەکەی لە فلان دەچێ*

کۆکە کۆکە
هەی کۆکە کۆکە ئەو کوڕە چەند کۆکە
شەرواڕەی شینە شارەی دەسرۆکە
دەستی دا برنۆی دای دەنا چۆکە

هەی لاوە لاوە ئەوکوڕە چەند لاوە
برینی گران بوو نەی کرد سراوە
ڕانکو چۆخەری لێ بەجێ ماوە

* لە (ئامینە) وەرگیراوە _ تەمەنی (٨٧) ساڵە _ خەڵکی کۆیە.

هەی شەڕە شەڕە شەڕە لەبەر ماران
چریکەی کوردان دێ وەک شاهی ماران
دەرێن کوژرایە خوارزایێ خاران

هەی شەڕە شەڕە شەڕە شەڕ لە قەراجی
دەنگی تۆپان دێ لە چیای باواجی
برینی ئەو لاوەی نەکرا علاجی

هەی شەڕە شەڕە شەڕە لەبن بەردی
ئەو شێرە کوژرا ڕۆژ لەسەر زەردی
کوڕێ دزەییان کردیان نامەردی

## شیوەن بۆ باوک :

خۆشەویستی باوک لە ناو خێزاندا شوێنێکی دیاری هەیە، بەسەرۆکو سەرپەرشت کەری ماڵ دائەنرێ، قەڵای ماڵە.. هۆ گری ژنو مێرد و پێکەوە ژیانیانو دڵسۆزیان جوانترین وێنەی بەختەوەرییە بەمردنی پیاو قەڵای ماڵەکە ئەروخێ، منالان ڕەنگیان ئەبزرکێ، گەورەترین بۆشایی لەماڵا دروست دەکات لەبەر ئەمە کە دەمرێ گەورەترین شینیشی بۆ دەکرێ. وەک لەم لاوانەوەیەدا دیارە:_
بەناوی (کەسم نەما ) یە ئەم جۆرە شینە بەزۆری لەناو ژناندا بەم جۆرە ڕوو دەدات کاتێ کۆمەڵە ژن لەدەرەوە ڕوو دەکەنە ناو تازیەکەو ژنێکی بەتەمەن پێشیان دەکەوێ پێی دەڵێن (ئەختیارە ژن) کە دەگەنە ناو حەوشەی ماڵەکە دەست بەجێو بەیەکەوە هاوار دەکەنو دەگرین.

کەسم نەما کێ شین کەرە
ترسم نەما بێتە دەرە

لەم کاتەدا دوو سێ ژنی کەسی مردووەکە ڕوویەڕوویان دەڕێنو شین گەرم دەکەن لەیەکتری وەردەگرنەوە بۆ یەکتری دەڵێنەوەو لە خۆ دەدەن:_

کەسم نەما کەسی کەسان
کەسم نەما لە مەجلیسان
کەسم نەما بکات قسان

کەسم نەما ماڵ بێ ماڵخۆ
کەسم نەما مشکیو زاخۆ
کەسم نەما بەسەری خۆ
کەسم نەما لۆ سەری خۆ
کەسم نەما هەیرۆ هەیرۆ

کەسم نەما لەوێ بەری
کەسم نەما سوار پەری

کەسم نەما عەشیرەتێ
کەسم نەما کەلەگەتێ[1]

ئەگەر هاتو مردووەکە گەورەی ماڵ بوو وەژنو منداڵی لەپاش بەجێ مابوو. بەم جۆرەی خوارەوە هەندێ جار دەیلاوێننەوە:-

[1] بڕوانە: ڕۆشنبیری نوێ ژ. ١٠٣_١٠٤ ل٢٦٠_ ٢٦١

هەی ڕۆ هەی ڕۆ هەی ڕۆ
بۆ سەرداری ماڵێم ڕۆ
بۆ بابی منداڵانم ڕۆ
بۆ گەورەی ماڵێم ڕۆ
بۆ منداڵی بێ بابم ڕۆ
بۆ مەڕی بێ شوانم ڕۆ
بۆ جووتی بێ جوتێرم ڕۆ
بۆ کۆلەکەی نێو ماڵم ڕۆ
بۆ بێ کەسیکەی خۆم ڕۆ
بۆ ڕیش سپی ئاوەدانیم ڕۆ
بۆ پیاوی نێو پیاوانم ڕۆ
هەی ڕۆ هەی ڕۆ هەی ڕۆ

نمونەیەکی تر :-

| | |
|---|---|
| بەم بەهارە | وای وای وا وەیلێ |
| شێرە قەهارە | وای وای وا وەیلێ |
| بەم پایزە | وای وای وا وەیلێ |
| شێرە عەزیزە | وای وای وا وەیلێ |
| ترکەی نەوی، کەوتە زەوی | وای وای وا وەیلێ |
| هەی لاوی هەی لاو کوڕە زەردەلاو | وای وای وا وەیلێ |
| بردیان بەتاو | وای وای وا وەیلێ |
| نایان لەچاو | وای وای وا وەیلێ |
| بەم هاوینە | وای وای وا وەیلێ |
| وەعدی شینە | وای وای وا وەیلێ |
| تەقەی لانکە | وای وای وا وەیلێ |

| | |
|---|---|
| کوڕ بێ باوک | وای وای وا وەیلێ |
| نەرم نەرم | وای وای وا وەیلێ |
| مەیکە شەرم | وای وای وا وەیلێ |
| هەر نەمردیە | وای وای وا وەیلێ |
| جوانە ڕۆیە | وای وای وا وەیلێ |

بەلام ئەگەر پیاوێک خاوەنی دیوەخان واتە زیاتر ناودار و شینەکەی زیاتر گەرمو بەگوڕ دەبێ. لەم جۆرە شینانەدا دەتوانین دەست نیشانی چۆنیەتی سەردولکەی ئەم جۆرە شینە بکەین.

کۆمەڵێکی زۆر هەڵدەستن چوار یان پێنج لەناو شینەکە دائیرەیەک دەبەستن ئینجا بەلایەک دەسوڕێنەوە هەنگاو دەنێن بەلام بەهێواش بەسنگو دەمو چاویانو لەسەریان دەدەن یەکێک لەوانەی کە لە دەوریان ڕاوەستاوە کەسی مردووەکە بەلام نزیک نیە بۆیانو دەیلێ ئەوانیش بەیارمەتی ئەو کۆمەڵەی کە ڕاوەستاونو ئەوانەی شینەکە دەکەن دەی گێڕنەوە وەبەنۆرە ناوە ناوە یەکێک دەردەهێنن ئەگەر هیلاک بوو یەکێکی تر دەچێتە جێگای وە دوایش بەدانیشتنەوە دیسان شین دەکەن دوایی یەکێکی لێ هاتووی پیر دەیان وەستێنێ و نەسیحەتیان دەکات دەڵێ ڕۆڵە گوناهە بۆ وادەکەن خوا پێی ناخۆشە وە فاتحە دا دەدات.

ئەگەر باوک پیاوێکی گەورەی لێ هاتوو بێ سەردولکەی دیوانێ و دیوەخانی بۆ دەڵێن وەک:_

دیوانێو دیوە خانێ
دیوانێو دیوا خانێ کۆر بم ئاغا دیوانێ
دیوە خانێ برشێتن
ئاغای تێدا بنوێتن
دیوانێو دیوە خانێ نەمان ئاغای دیوانێ

دیوە خانێ لەکەندێ
ئەما ئاغاو ئەفەندێ[1]

## شین بۆ پیاوان :

هەشەڕە شەڕە شەڕە لەماوەتێ
لەشکری دزەییان گەییە کۆسرەتێ
کاکم کوژرایە لە عەشیرەتێ
عێلی دزەییان کەلەی کەتێ
× × ×
ڕێی ئەو گوندەم پانو بەرینە
قەمەرەی کاکم شینی خەمرینە
دوژمنی نامەرد لێی دانیشتینە
علاجی نیە دەستان هەرینە
بێ غیرەت نەبوو خودا نەی هێتە
× × ×
هەی نایێ نایێ کاکی خۆم نایێ
بەقەمەرەوە بازۆ سەرایێ
مەیتی وی کەتیە وا لەسەحرایێ
عەشیرەت دوورە لە هانای نایێ
× × ×
لە ماران ڕاهات کاکە بەکزی
چەنازەی چەقاند لە سبلەی ڕەزی
توخوا مەیکوژن کوڕێ (مامزی)[*]

---

[1] ئەم شینەم لەزاری عیسمەت عەبدول قادر وەرگرتووە_ تەمەنی (٤٥) ساڵە، خەڵکی کۆیەیە لەگەڕەکی سەرباخ دادەنیشێو نەخوێندەوارە.
[*] مامز_ ناوی ئافرەتێکە.

هەی شەڕە شەڕە شەڕە لەکەر کێیە
ئەو کوڕە کوردە مل بە زرێیە
توخوا مەیکوژن دایکی چاوی لێیە

## شین بۆ کوڕو لاوی گەنج:

کوڕی گەنج: کاتێ کە کوڕێکی گەنج دەمرێ شیوەن وشینو گریانێکی بە کوڵو بە سۆزی بۆ دەکەن وەخزمو کەسو کاری بێ بەزەییانە لەخۆیان دەدەنو هاوار دەکەن. ئەم جۆرەشینە لە (٣_٦) ڕۆژ دەخایەنێ لەگەڵ لەخۆدانیاندا قوڕو گڵ ئەکەن بەسەر خویاندا وە قژیان دەردێنن، هەروەها گەلێ جار براو ئامۆزای مردووەکەش لە خۆیان دەدەنو گڵ و قوڕ ئەکەن بەسەریاندا وەکو ژنەکان، هاوار دەکەن (برا ڕۆ برا ڕۆ) وەلە شین کردن بەم جۆرە بەسەر کوڕی گەنج دا هەڵ دەدەن، پیاهەڵدانیش هەر وەکو وتمان زۆر جۆری هەیە بەگوێرەی ئەو ئاکامانەی کە کوڕەکە تیای هەڵکەوتووە لە سوار چاکیو ڕاوچیەتیو دەستو تفەنگو خوێندنو پلەو پایەو....هتد.

ئەمەش جۆرێکە لە پیاهەڵدانی کوڕی گەنج:-

| | |
|---|---|
| هاتوو گەییە هەولێرێ | پەیدابوو لە هەولێرێ |
| بەژنت داری کنێرێ | رەبی کارت بە خێرێ |
| هاتوو گەییە کەرکوکێ | پەیدابوو لە کەرکوکێ |
| ڕوومەت پەنکی کرووکێ | (فلان) سواری پێش بووکێ |
| هاتوو گەییە بەغدایێ | پەیدابوو لە بەغدایێ |
| لرفە لرفی تارایێ | دوورە قلقەزی نایێ |
| هاتوو گەییە ڕەواندزێ | پەیدابوو لە ڕەواندزێ |
| ڕوومەت پەلکی نێرگزێ | (فلان) کاکەی مامزێ* |

* هەمینە احمد_ تەمەنی٦٥ ساڵە_ هەولێر _ گەرەکی ڕوناکی.

**بنەفشا ناریٚ**

هەی لوری، لوری کوڕی من لوری
هەی داوو داوو، جەمبەلی داوو
تابیتا جەمبەلی، ل بن دارا بیٚ بادیٚ

**داوو**

هەی داوو داوو، شیوالی داوو
هەی لوری لوری، جەمبەلی بیٚ من لوری
دیٚ تابیتا جەمبەلی بیٚ خوە بدەم زوزانیٚ
ژووریٚ، هەی لاییٚ لاییٚ، لاندکا من لاییٚ
ئەز دیٚ دەست بلو بنکا پیا شدینم.
یا دەستا هێلم نەکری
ئەز دیٚ قەستا عزیزیٚ دلی خوکەم
ئەز دیٚ برین دلی وی دەرمانکم

**کەوەکەم دەویٚ:**

ئەم جۆرە گریانە تایبەتـە بـەکوڕانی گەنجـەوە کـە هێشتا ژنیـان نـەهێناوە یـان دەستگیران داربیٚ یاخود خێری لـە دونیـا نـەدیبیٚ، بەڵام وەکە خـۆم بەشداریم لـە شینو لاوانەوەی ناو ژنانی هەولێردا کردووە ئەم شـینەیان بـۆ پیـاوێکی نـاو داریـش وتووەو دەنگە و ئاوازی شینەکەش لەگەڵ مردووەکەدا و ژناندا گونجاوە:

**بۆ نمونە:-**

کەوەکەم دەویٚ کە دانی سوورە
یارەکەم دەویٚ بەتام و تۆرە
× ×

کەوەکەم دەوێ لەوان کە دانێ
یارەکەم دەوێ لەوان جیرانێ
× ×
کەوەکم دەوێ کەوێ شکستی
دەستە لەتیران لێکدا ببەستی
یارەکەم دەوێ کەس رووی نەکەسی*

## لاوژە یان لاوژۆکە :

مامۆستا ( عومەر ئیبراهیم ) دەڵێ: ئەم جۆرە گریانە تایبەتە بە پیاوانی هەژارو رووتو کرێکارو جوتیارو برژاوی ئیشە. بە پێچەوانەی سیوە خانێو شانە شینە, چونکە بۆ دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتوانە کەچی لاوژە (وەکو گوتمان بۆ هەژارانە ) ڕاستی یەکە هەر وەکو لەم ساڵانەدا هەر ئەوەی بیناسمو گوێم لێ بێت لە هەولێردا چوومەتە ناو شینی ژنانەوە بەنیازی هاوبەشی کردنم لە گەڵیاندا, دووەم لەبەر نووسینەوەی تایبەتی ئەم بەشانە. جا چەند جارێک هاوبەشی شینی گەورە پیاوانو ناودارانم کردووەو ئەم ( لاوژە ) ی تیاوترا. ئەتوانرێ بوترێ ئەم لاوژە بۆ پیاوانە بەگشتی_ نەک هەژارو رووت و کرێکارو جوتیار:

**بۆ نمونە :-**

لاوە، لە سەربانی
دەکوتێ دەرمانی
ئەشقەو کچێ مامی
لاوژە لە سەر توێ
دێ دەنگی تەمبورێ
ئەشقەولە کچێ پورێ
× ×

* رۆشنبیری نوێ _ ژ ١٠٣ , ١٠٤ _ ل٢٦٦.

لاوژه تومێ تومێ
بەژنت بێی جۆمێ
بەشەرت برای خۆمی
× ×
لاوژه لە بانانداا
بەکناری جوانانداا
یاری ملەکێ تێداا
تفەنگ لە کۆلێ دا
نێچیر بە کرادێ دا
× ×
لاوژه ڕاژی ڕاژی
بەتولەو بە تاژی
یار بەبێ تو ناژی
× ×
لاوژه لاری لاری
وەکی دەچیە شاری
لێم برا دیاری
داکت بە بێت ناژی
× ×
لاوژه چووه ئاشی
نەی خوارد لەباراشی
× ×
لاوژه کە نەختێ
لە کێ بە دەرکەتێ
غەم بوو لە دوم کەتی
× ×

لاوژە لە ئاشی یە
بەزمانی تورکی یە
بەکە دێی سپی یە
× ×
لاوژە کەوێ مۆرە
بەس برۆ بەنۆرە
تار لە دوو تۆ زۆرە*
× ×
لاوژەی لاری لاری
لاوژۆکەم لاوە
بالیف کورکی ئەوی
لاوژۆکەم لاوە
لە کوێ دەنوێ شەوێ
لاوژۆکەم لاوە
بوکت بۆ دێتمەوێ
لاوژۆکەم لاوە

ئەمە شینو گریانە بۆ کورێک دەوترێ کە هێشتا ژنی نەهێنا بێ واتە گەنج بێت:-

وای وای وا وەیلێ
ئەو کورەجوانە وا وەیلێ
دەستو سەعاتی وا یلێ
وای وای وا وەیلێ
ڕانکو چۆغەری وا وەیلێ
وای وای وا وەیلێ
دەستو حەلقەی وا وەیلێ
وای وای وا وەیلێ

* ڕۆشنبیری نوێ ل٢٦٣ _ ٢٦٤

**ئەمەش جۆرێكە لە شینو لاوانەوە بۆ گەنج و لاوەكان:-**

| | |
|---|---|
| بە قوربانت بم ڕۆڵە | لای لایە لای لایە |
| ئەوجا بەكێ بلێم ڕۆڵە | لای لایە لای لایە |
| كوڕەكەم لای لایە | لای لایە لای لایە |
| بە قوربانی ماڵی چۆڵت بم | لای لایە لای لایە |
| بە قوربانی بەژنو باڵات بم | لای لایە لای لایە |

**ئەمەش نموونەی لاوژەیە : -**

لاوە لەسەر بانی
دەكوتێ دەرمانی
ئەشقەو لە كچێ مامێ
لاوژە لەسەر شوورێ
دێ دەنگی تەمبوورێ
ئەشقەو لە كچێ پوورێ
لاوژە تۆمی تۆمی
بەژنت جۆمنی
بە شەرت برای خۆمی

**نمونەیەكی تری لاوژە : (سەردولكەی لاوژۆكەم لاوە)***

لاوژۆكە لاوژۆكە لاوژۆكە لاوە
لاوژۆكە لاوژۆكە كوڕەم بێ چاوە

* ئەم سەر دولكەیە چەند ئافرەتێ یاخود خزمی مردووەكە یانی ژنی لاوە مردووەكە ئەیڵێ و ئەوانی تر بۆی دەسەننەوە، شینەكە بەپیوە دەكرێو ئافرەتان بەریكی و لە شیوەی بازنەیی ڕادەوەستن، چوار ژنیش لە ناوەراستی شینەكە لە خۆیان دەدەن. ژنیك یا دوو ژن بەندەكانی دەڵێنو ئەوانی تر دەگیرنەوە. ئەمەش بە زۆری لە ناوچەی دزەییان باوە وەك خوشكە (ئاواز ئەحمەد) بۆی ڕوون كردینەوە.

لاوژە لاژی
لاوژە لاژی
دۆت مام بێ تۆ نازی
لاوژۆکەم لاوە
لاوژەی لە سەر شووری
دێ دەنگی تەمبوری
ئەشقە لە کچە پووری
لاوژۆکەم لاوە
لاوژۆکەم لە کەندێ
تفەنگ لە گوڵمێ دا
دۆت مامت بەکێ دا
لاوژۆکەم لاوە
لاوژەی شەروارشین داخ*
قەت مەکیشە ئاخ
لەدووت دەبمە بەیداخ
لاوژۆکەم لاوە
لاوژەی لێرە لەوێ
بالیف کورکی کەوێ
لەکوێ دەنووی شەوێ
دۆت مام* دەیتە ئەوێ
لاوژۆکەم لاوە
لاوژەی لەسەریانی

---

* شین داخ: جۆرە قوماشێکی خەت خەتە، خەتەکانی ڕەنگیان شینە.
* دۆت مام: کچە مام بەکرمانجی ژووروو.

لۆت بکوتن دەرمانی
بنێن لە برینانی
ئاشق کچە جیرانی
لاوژۆ کەم لاوە
لاوژەی تۆمی تۆمی
دەڵێ ی سواری ڕۆمی
کوڕی پلکی خۆمی
لاوژۆکەم لاوە
لاوژەی لاری لاری
وەکی دەچیە شاری
خەنەی دیتی دیاری
لاوژۆکەم لاوە

## هەی ناریەند بۆ کوڕی گەنجو لاو دەوترێ:-

ئەو ناریەندەم هی کوڕە جووە
ناران لێدەن زوو بە زووە
لەشکر ڕۆیی سوار لە دووە

× ×

ئەو ناریەندەی لە قەراتێ
ناران لێدەن ڕۆژ هەراتێ
سوار ڕۆیی بووک نایگاتێ

× ×

ئەو ناریەندەی هی کوڕە کۆیی
ناران لێدەن هەشتو نۆیی

بووکیان هێنا سوار ڕۆیی

× ×

ئەو نارێەندەم کوڕە کوردە
ناران لێدەن هوردە هوردە
سوار هاتن لەشکر گردە
هەی نارێەندە هەی نارێەندە

× ×

چیدی ناکەم نارێەندانێ
دەچمە سەرخمی ڕەشوانێ
لێدەن جلکی بووکە جوانێ
هەی نارێەندە هەی نارێەندە*

* ئاواز ئەحمەد دەڵێ: ئەم (هەی نارێەندە) لە خوالێخۆشبوو پلکە (مامز) ی قولتەپەیی کوێ لێ بووە تۆمارم کردووە، ئەم بەندەش هەر بۆ شینی بە پێوەیە بۆ مردووی گەنجە. بڕوانە کتێبی فولکلۆری کوردی ناوچەکانی دزەییاندا.. کۆ کردنەوەی (ئاواز ئەحمەد دزەیی) ، ل٦٢.

## بۆ کچی گەنج

چۆن بۆ کوڕی گەنج شینو گریان دەکرێت، بۆ کچی گەنجیش شینو گریان ئەکرێت. پیاوەڵدا ئەکەش بە گوێرەی لێ وەشاوەی کیژە دەبێ شینەکە گەرم دەبێ بە تایبەتی تازە بووکە یا کیژێک بەهۆی نەخۆشیو کارەساتو بە ڕووداوێکی دڵتەزێن کۆچی دوایی کرد، ئەوە شینی گەرمی بۆ دەگێڕدرێ. وەک لەم نمونانە دەبینرێ:

١_ بووکانە بووکانە بووکێ                دایکی لە جلکانە بووکێ
ماری بێ کلبانە بووکێ
بووک هاتیە لەشاری بووکێ                دەستو پێ مرواری بووکێ
لۆ عارەب سواری بووکێ
ماینێ گێ کلچووکە بووکێ                سەر زینی کرووکە بووکێ
بووک تازە نوو بووکە بووکێ
دەستو دەستەوانە بووکێ                هەموو دایە کوڕانە بووکێ
هێشتا سەر گرانە بووکێ
دەستو هەنگوستیلە بووکێ                هەموو دا بەرتیلە بوکێ
دایکی ناقایلە بووکێ
هێ کراس گازر گازرە بووکێ                لە زگی بەردام ئاگرە بووکێ
نەختێک وەرە خوارترە بووکێ
هێ کراسو کەوێتە بووکی                لە بەژنی یارێتە بووکێ
چەند شیرینی لێ دینە بووکێ*

٢_ لەشاری سلێمانی دایکو کەسو کاری کیژەکە بەم جۆرە دەلاوێننەوە:

هەی ڕۆ  هەی ڕۆ  هەی ڕۆ
هۆ کیژە جوانەکەم ڕوی

* سەرچاوە: _ هەمینە احمد _تەمەن٦٥ _ساڵ - هەولێر_ گەرەکی ڕووناکی

هۆ کیژە دەست ڕەنگینەکەم ڕۆ
هۆ کیژە جوانەکەم ڕۆ
هۆ کلبانی دایکی خۆی ڕۆ
هەی ڕۆ هەی ڕۆ کچی جوانم ڕۆ
بووکی بێ دەزگیرانم ڕۆ
کچی خێر نەدیوم ڕۆ
کچی بێ مرادم ڕۆ
ئەنگوستیلەی دەستی دایە ڕۆ
هۆ بووکێ ڕۆ، هۆ کچی خۆم ڕۆ
بە قوربانی بەرو جیازی بەجێ ماوت بم
بە قوربانی بووکی بێ زاوا بم
بە قوربانی دەستو پە نجەکانت بم
بە قوربانی کلبانی ماڵێ بم
بە قوربانی ئیشو کارەکانت بم
بە قوربانی تەونی دەستکردت بم
بەقوربانی مووروو و زەنگیانەکانت بم
بەقوربانی دەستەخوشکەکانت بم
بۆ مەڕ دۆشنی دەست ڕەنگینم ڕۆ
بۆ کلبانی ماڵی بلبی ڕۆ
بۆ برای بێ خوشکم ڕۆ
بۆ بلبی بێ کچم ڕۆ
بۆ ماڵی بێ کلبانم ڕۆ
هەی ڕۆ هەی ڕۆ کچە جوانەکەم ڕۆ*

---

* شینی (هەی ڕۆ هەی ڕۆ) لەبەر ئاوازی شینەکە بەکاردێنن و دووبارە کردنەوەی ئەو سیفەتو شتو کەرەستانەی کە ئافرەت یاخود کیژەکە خاوەنی بووە، وەک (کابانی ماڵێ، دەست ڕەنگینە، مووروو

٣ـ نمونەیەکی تر لە پێدا هەڵدانی ئافرەتی گەنج یاخود ژنێک تازە مێردی کردبێ یان دوو سێ منداڵی لە پاش بەجێ مابێ، بە تایبەتی لە ناوچەی سلێمانی دا:

| | |
|---|---|
| وای وای وا وەیلێ | وای وای وا وەیلێ |
| دەبکەن لێ دەبکەن لێ | وای وای وا وەیلێ |
| هەرچی خوشکە دەمی وشکە | وای وای وا وەیلێ |
| دەست هەڵبڕن پرچ دەرێنن | وای وای وا وەیلێ |
| هەرچی کچە بێتە ئەم شینە | وای وای وا وەیلێ |
| هەی لێ وا وەیلێ لەیلی جوان بێ | وای وای وا وەیلێ |
| ماڵی باوکی ئەسڵ زادەبێ | وای وای وا وەیلێ |
| بردنەوەی لەیل لە وەعدەی بێ | وای وای وا وەیلێ |
| هەرچی خوێشە | وای وای وا وەیلێ |
| بۆی بە ئێشە | وای وای وا وەیلێ |

٤ـ هەروەها جۆرە لاوانەوەیەکی تر هەیە پێ ی دەوترێ (وای وای وا وەیلێ):

وای وای وا وەیلێ
ئەوەل بۆ مەجنون دوهەم بۆ لەیلێ
وای وای واوەیلێ
بووکی جوانم وا وەیلێ
نەو نەمامی بلخم وا وەیلێ
توخوا بووکێ چۆن واتەبێ
بەم بەهارە ماڵ چۆڵ ئەبێ

---

زەنگیانە، بەرو جیازی، ئەموستیلە....هتد) کە ئەمانە لەگەڵ بەکار هێنانی وشەی (بە قوربانو هەی رۆ) زیاتر کەسانی ناو شینەکە دەجولێنێو سوزیان هەڵدەستێنێ.

وای وای وا وەیلێ
گوڵی باخانم وا وەیلێ
کۆرپەی نازدارو فریشتەی جوان
پەپوولەی سپی ناو باخی گوڵان
بێچووە جوانەکەی خاوێنی من
وای وای وا وەیلێ

٥_ هەروەهاجۆرە لاواندنەوەیەکی تر هەیە ئەویش هەر بۆ ئافرەتو پیاو دەوترێ بەناوی (هەتارەکێ و موبارەکێ) کە ئافرەتێکە ئەیڵێ و ئەوانی تریش بە دوایەوە ئەیلێنەوە، جیاوازی ئەم جۆرەش زیاتر لە رستەکاندایە لە جیاتی (بووکە لێ تۆراوەکەم) ئەبێ بە (حاجی یاخودپیاو ...) یان (حاجی حەجت موبارەکێ).

هەتارەکێ و موبارەکێ
ئەم سەفەرەت موبارەکێ (حاجی یاخود بووکێ) دەوترێ
هەتارەکێ و چاوەکەم
بووکە لێ تۆراوەکەم
هەتارەکێ و وا وەیلێ
باوان شێوێ لەیلێ
هەتارەکێ و لەم لاوە
بووکێ بگەڕێوە دواوە
هەتارکێ نەورۆز بێ
بەرگی سپیت پیرۆز بێ
هەتارەکێ و لە زێرە
ئەم بووکە عەزیزە
هەتارەکێ و چاوانم
بووکێ لە جێ ی هەمووانم

دایکێ بۆ کێ واڵەکەی
تۆ کێت دیشێ بۆ دەنگ ناکەی*

٦_ لۆم برێنە داکی سینەم دەرێنن سینەم مردیە
لۆم برێنە وەستاکاران ببڕێ کێلێ سپیە
برێنە کاکی کیژەی باژوا بۆرەی بەحریە
بچنە کن شاهی ماران نەخوا دوو چاوی سپیە
سینەمی کۆچە کۆچە سینەم گەلەک بێ حارە
برێنە وەستاکاران ببڕێ کێلی بەخارە
برێنە بابی کیژەی دەرێنی ماینی عەدارە
شاهی ماران تێ گەیێن نەخۆێ دووچاوی کارە

٧_ بووکانە بووکانە ڕۆ بووکێ
لەبەر بووکە شۆڕێ ڕۆ بووکێ
مامزی دەو بەستۆڕێ ڕۆ بووکێ
کیوبەو کەتە تۆڕێ ڕۆ بووکێ
ڕاوکەر کەتنە گۆڕێ ڕۆ بووکێ

٨_ گور بووی لە گورە زەردی
شین بووی لە سەر بەردی
کەتیە دەست نامەردی
کراسو کەوێو جلک ڕۆ بووکێ

* ئایشێ فەرەج _کەرەکی تووی مەلیک _ تەمەن ٤٥ ساڵ _ نەخوێندەوارە.

لە بەژنەکی شکێ ڕۆ بووکێ
شیرنەو لێت دێ جلکێ ڕۆ بووکێ
کراسەی سپیە ڕۆ بووکێ
گەزو مەجیدیە ڕۆ بووکێ
هێشتا ڕازی نیە ڕۆ بووکێ

ماینێ بووکێ بۆرە ڕۆ بووکێ
سەر زینەی گۆرە گۆرە ڕۆ بووکێ
قۆناغ گردە سۆرە ڕۆ بووکێ

لەبەر بووکە جوانێ ڕۆ بووکێ
مامزی نۆغەرانێ ڕۆ بووکێ
کیویەو کەتە لانێ ڕۆ بووکێ
ڕاوکەر دای دەرژانێ ڕۆبووکێ
چشتاق نەی وێرانێ ڕۆ بووکێ

ماینێ بووکێ ڕەشە ڕۆ بووکێ
سەر زینەی بە نەخشە ڕۆ بووکێ
بەختی بەگی ڕەشە ڕۆ بووکێ

٩- کە پرەکت لێ بکەم لە ناو کەپرۆکان
داوێ مە کەپرێ پەلکی گوڵۆکان
لە ناوی دانێن زاواو نۆ بوکان
× ×

کەپرەکت لێ بکەم لەڕێی دەربەندی
داوێ مە کەپرێ خاو و گیلبەندی
لاوێی لێ دانێت بە زاوا بەندی
× ×
کە پرەکت لێ بکەم لە ڕێی هەولێرێ
داوێ مە کەپرێ پەلکی کنێرێ
یاخوا ئەو لاوە ئاوی بەخێرێ
× ×
کە پرەکت لێ بکەم لە ڕێی کەرکوکێ
داوێ مە کەپرێ داری مێکوکێ
ئەو لاوێیە سواری پێش بوکێ
× ×
کە پرەکت لێ بکەم هەر لە ڕێی کوێێ
داوێ مە کەپرێ گوری هێروێێ
سوارێ لە ڕێی نەینی نسکوێێ
× ×
کە پرەکت لێ بکەم لەناو توتنێ
داوێ مە کەپرێ پەلکی سوسنێ
لە ناو نەکەی خەوی مردنێ
× ×
کە پرەکت لێ بکەم لە لوتکەی شاخی
دەڕازێتمەوە بە گوری باخی
لەناو دانیشی نەکێشی ئاخی
× ×
کە پرەکت لێ بکەم هەر بەچناران
داوێ مە کەپرێ خوخ و هەناران
لەناو دانیشی بابێ منداران

× ×

کە پرەکت لۆ بکەم لە رێی دووگردکان
دەرازێنمەوە بەگورو هەراران
بابم دانیشی هەر وەکو جاران

× ×

کە پرەکت لۆ بکەم لە رێی شەقڵاوە
دەرازێنمەوە بە گورو لاوەوە
تێدا دانیشی ئەو بەرەک چاوە*

١٠_ نمونەیەکی تری پێداهەڵدان بەسەر ئافرەتێکی شوو نەکردوو یان ئافرەتێکی جوانە مەرگی خێرو خۆشی لە ژیان نەدیو بە ناو نیشانی (شینی مەمکی نازدارێ) ئەمەش لەناو دزەییاندا باوە لە هەولێرێ.

مەکی نازدارێ دوو زەردە بێیە
دەستی مەدەنێ لەبن کەوێیە
کاکی بزانێ خەجەی دەوێیە

× × ×

مەمکی نازدارێ دوو سێوی ئارە
دەستی مەدەنێ هەددی مەمارە
کاکی بزانێ خەجەی هەر یارە

× × ×

مەمکی نازدارێ دوو سێوی ترشە

---

* ئاواز احمد حمد ئەمین دزەیی _ خوێندەوارە (فۆلکلۆر ناسە _ بەرهەمی فولکلۆری هەیە.... تەمەنی ٤٢ ساڵە لە گوندی دووگردکان لە دایک بووە _ لە دەشتی هەولێر ناوچەی دزەییان، بەڵام ئێستا لە هەولێر دادەنیشێ.

دەستی مەدەنێ رایان مەگوشە
کاکی بزانێ خەجەو قوماشە*

١_ خۆ ئەگەر هاتوو ئەو ئافرەتەی ژنی ماڵ بێتو منداڵی لەپاش بەجێ مابێ بەم جۆرەی خوارەوە منداڵەکانی دەیلاوێننەوە:_

بۆ کابانی نێو ماڵێم رۆ
بۆ کابانی گەرمێنوکوێستانم رۆ
بۆ دایکی منالانم رۆ
بۆ کابانی دەست بەکەو گیرم رۆ
بۆلانکی بە جێ ماوم رۆ
بۆ منداڵی بێ داکم رۆ
دایە رۆ دایە رۆ دایە رۆ
بۆدایکی بێ مرادم رۆ
بۆ دایکی دەست رەنگینم رۆ
بۆ دایکی هەناسە ساردم رۆ
بۆ ماڵی بێ کابانم رۆ
هەی دایە رۆ هەی دایە رۆ هەی دایە رۆ

١٢_ نمونەیەکی تر ئەوە دەردەخات منداڵەکان چۆن دایکیان دەلاوێننەوە:
دایکی شیرین لە دوای تۆ وێرانە ماڵم
وێڵو سەرگەردان پەشێوە حاڵم
ئەوا رۆیشتی منت بەجێ هێشت
ئەزانی لە دوات چەندم جەفا چێشت

تێبینی: لە گۆڤاری کاروان ل١١٥ _ ژ ٤ وەرگیراوە _ نوسینی مامۆستا عومەر ئیبراهیم عەزیز.

دایکی دڵسۆزم تەسەم بەدڵی ماتو غەمگینت
بە دەم وانەی خۆش‌وشیرینت
بە دەنگی نەرم‌و لەشتی بێ تینت
خۆراکم بووە شیوەن و شینت*

١٢_ وەئەم لاوانەوەش لە ژنێکی تـرم وەرگـرت کـە بـۆ کچەکـەی دەلاوێنێتـەوەو یەکەم جار بوو کە یەکێ لە خێزانەکەی بمرێ ، زۆر کاری تێ کردبوو:_

تو وەک شەمامەی ڕوڵە
وەیارە ماوە، بژان وەک ئەڵماس وە ڕووی گۆناوە
نەم زانی عمرد هێ لە کەمین
وەک خۆر ئاوا بووید لە ڕووی سەر زەمین
تو یەک نەوتونلە نەمام بوید رۆڵە سەوز بووید لەباخم
نەخواردم بەرد هەر بوید بە داخم
++++++
دایک کاتێ کچەی لە بەردمیا بووە بۆی دەلاوێنێتەوەو دەڵێ:_

داری تیام بنی لە شیشە
ئەو خوار کەندەی لە ڕیشە
ڕۆڵەشەوان مەخەفتم بەرم لەلاتە
دڵەی کۆس کەفتیم هەر بە تەماتە
باوکم وە قوربان دوو دیدەی تەیرت
ئەم خوداوەندە نەهێشت تێر بکەم سەیرد
ئەوەن لاڵیامەوە لە خوداو لە پیر
نە دوعام قەبول بی نەترام بی یەگیر

* تێبینی:_ ئەم نمونەیە لەسەر گۆڕی (حبیبە مستەفا) نووسراوە لە کۆیە.

ڕۆڵە ئەگەر مەیلەگەد فەراموشم بود
سفیدی کەفەن باڵا پۆشم بود
دەریکەم دیدەی خۆم لەبن
ئیتر نەبینم دنیا وەبی توون*

## شیوەن بۆ دایک:-

دەڵێن باوەشی دایک خۆشترینو جوانترین هێلانەی ئارامی مرۆڤە، مرۆڤی بێ دایک کۆتری بێ هێلانەیە. هیچ مرۆڤێک ناگاتە پلەی دایک لە هەڵگرتنی نازی منداڵو شەو و شەونخونیو خزمەت کردنی. جا لەبەر ئەو خۆشەویستییە پتەوەی دایک و کەسانی خێزان بەمردنی دایک کۆلەکەی ماڵی ئەروخێ و گۆڕانێکی گشتی نائارامی لەماڵ دروست دەبێ _ تارای خەمو بێ ئارامی ماڵەکە دادەگرێ جالەبەر ئەمەیە کە دایک دەمرێ ئەگەر کچی هەبێ هەستو سۆزی گەرمیان دێتە جۆشو بەگریان ولاوانەوە خەمەکانی دایکیان دەردەبڕن.

لە کوردەواریدا بۆ ژنی ئازاو جوامێریش شیوەنو لاوانەوەی بۆ کراوەو هەر یەکە بەپێی ئەو کردارەی کەتیایا بەناو بانگ بوو. ئیتر دایک یا فەرمانبەرە یان کابانی ماڵ، یاخود ئافرەتێکی دادپەروەر یا دەست ڕەنگینە واتە (مافوور دروست دەکات، دروومان دەکات) بەم جۆرە بەسەر ئافرەتی کابانی ماڵدا سەردولکە دەوترێ:_

کابانی لاری لاری کۆنکەو کەو گیران دەریتە لە باری
چەند شیرین بوو وەکی دادەنیشت لەبەر بیری هەزاری

کابان هەر چین چین لە دەستی دایە گارۆشەکی خاسە ڕەنگی منە
کابان دەریتە شوانی چۆن چۆتم لۆ بینە

* خدیجە مای خان کوچەک، تەمەن٥٠ ساڵ، گەرەکی شەهید ئەحمەد _ خانەقین ١٩٧٩.

مامزی سەنیو مەنی هێلانەکەم لۆ بکە لە کاولە مەفتەنی
تازیەی کورەتیم حەیرانی‌یە کەس پێ نەکەنی

**یاخود:-**

هەی بێری بێری بێ مەدوونە          یەقە بە دوگمە خاریان لە ڕوونە
مەڕێ بلێ تو لۆ کێتدەر چوونە          یەقە بە دوگمە گوارە لە گێتە
هەی بێری بێری بێر بێ مەسێ نە
ئەگەر نایان ناسی مامزو فاتمو خەجێتە

ئەتوانین بڵێین لەشینی ژناندا واتە کەژن شین ئەکا زیاتر ڕەگەزی لیریکو دڵداری زاڵە لەگەڵ دەربڕینی بێزاری لە تەنیایی‌و خەمو ئازار بۆ مردووە لە کیس چووەکە. لەم شینەدا داوا لە مردووەکە ئەکرێ کەئەمانیش لەگەڵ خۆی بەرێ.*

**نمونەیەکی تر :-**

مەمکی نازداری

مەمکی نازدارێ          دوو زەردە بی یە
دەستی مەدەنێ          لە بن کەوێ یە
کاکی بزانێ          خەجەی دەوێ یە
مەمکی نازدارێ          دوو سێوی تارە
دەستی مەدەنێ          هەری مەمارە
کاکی بزانێ          خەجەی هەوپارە
لێم دا نوقرانە بووکێ
هێشتا سەر گرانە بووکێ

* م. ب_ رودینکۆ..... ل۳۱۹

## سەردولکەی کابانی چاک :_

کابان لۆ گۆتیمە کابانان
پارزۆنی خۆ بشۆن
با دێتە سەر دەرکی ئامانان
ئەتوی کابانەکی گەلە جوانی
هەستا بکا نمەیانێ میوانان
× × ×
بێری لاری لاری ئەتۆ بێرییەکی گەلە چاکی
مەنجەڵوکارۆشانت لۆ دەنێم لەباری
حەیران جێریەکی گەلێ چاکە دادەنیشی لەبەر هەزاری
× × ×
لەوان دانان هەتا ئەوان دانان
سێبەری قەرەچوطی دێتە خواری
بەسەر بێری‌و شوانان
دۆ تمامێ دەکەمە بێریێ هەردوو دانان
× × ×
بێری بێریەکەت لۆ دادەنێم لە براندانێ
بێری‌و بەرانی ماری باوت گەلە تووشن
پێت دەنێن لەپانی سۆلن
دەپسێتن گورینگێ هێزارو هەورێ
× × ×
لەسەر نانێ ڕوو مەنیشە نات بەرەو ژێرە
لایەکی کۆمنیت کیستانە ئەوەی دیت گەرمە شیرە
کابانەکی گەلە جوانە هەستە لە خەوێ

شیرەی مەسکانت هەراتن لەژێرە

× × ×

سەردولکەی تایبەت بەئافرەتی گەنجو خێرنە نەدیوو:ـ

مامزت لۆ هەندە سری

لە بەرانە هاتیٚ سواران

تەد ئەوی مامزە خۆم لۆ نلگری

با سواریێ باوکان لە دووت سواریی

بتبەنە خێری نوخمە بەکرێ

× × ×

مامزی بەقەنەوزێ

پێتانم لۆ بنیٚ لە کۆلی

دەستانم لۆ بنیٚ لە حەوزت

× × ×

مامزێ لە سەحرایێ

بنوو بە فێتکان

هەستە بە گەرمایێ

با سوارن لە دوو سواریێ

ئەوی مامزە لۆم بگێرنەوە

بێ ئاوێتە بێ ئارایێ

× × ×

مامز لە گوندی پردێ

هێلانەکم لۆ بکە

لەناو پوشیو نەخوردێ

سوارن گەیشیتمە سەرێ

هەستە بکە دەستو بردێ

× × ×

مامزێ هەورێ
دووخاری هەیە لە هەنێی
یەکە لێ بشێرەوە
ئەوی دێ بادێ
بن گرێ بەسێ هەورێ
× × ×
مامزێ لێ هەندە مەستی
گوارەت لەگۆێ یە
بازنت لە دەستی
ئێوارێو بیانێ
بەرامبەر کار ڕادەوەستی
× × ×
مامزێ گوێ مەقەسێ
هێلانەکم لێ بکە
لەسۆرکێ دۆرەزێ
پێتانم لێ بنێ لە کۆلی
دەستانم لێ بنێ لە حەوزێ

## لاوانەوەی دایک بۆ کوڕی شەهید کراوی :-

لەو کاتەوە کە مرۆڤ لەسەر زەوی بووە مردنیش لەگەڵیا پەیدابووە، لەگەڵ گەشەکردنی قۆناغەکانی ژیانو فراوان بوونی بیرو هۆشی مرۆڤ ژیانیان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو پێشەوە چووەو گەشاوەتەوە جا لەگەڵ ئەم بەرەو پێش چووە هۆزەکانی دەرو دراوسێ هێرشیان بۆ سەر یەک بردووە بەهۆی سنوور دانانو ئاو یان ...هتد.

جا لەو کاتەوە یەکەمین بەرگری کەر لە خاکو ئاوو نیشتمان لاوانی گەل بوونە کە لەو کاتەوە تاکو ئەمرۆ هەر ئەوانن بەخوێنی گەشیان شاخو بەردی ولات و خاکیان

بەخوێن ئاو داوەو خۆ بەخت کەر بوون بەرگریان لەخاکو نیشتیمانیان کردووەو هەمیشە سەنگەریان بۆ دوژمن چۆڵ نەکردووە.

هەر لەو کاتەوە کەلاوان خۆیان بەخت کردووەو شەهید کراون لەپێناوی ئامانجی گەلدا دایکان وەکو عەودالیان لێ هاتووە بۆ جگەر سووتاوی خۆیانو قارەمانێتی کورەکانیان گۆرانی شینیان وتووە. هەمیشە لە شینەکانیاندا لەگەڵ سووتانیاندا هانی لاوانی تریان داوە جێگای کورەکانیان چۆڵ نەکەن. یەکێک لەو دایکە شەهیدە کۆڵ نەدەرە (عایشە گولێ) ی کۆیە بوو... ئەو دڵی دایکانی دەدایەوەو دەیووت (مەگرین تاکۆش پڕ نەبێ، خاک پڕ نابێ دەبێ بۆ خاک شەهید بدەینو رووی نیشتمان سپی بکەین) ئەم شینە رەگەزی ئازاییو قارەمانیەتی لە بەیتەکاندا دیارە... وەک ئەم نمونانەی خوارەوە (بە دیالێکتەکانی زمانی کوردی):_

## (چەند نمونەیەک لە لاواندنەوەی دایکان) بەشێوەی لوڕی :-

- تیری داگەس لێم لەلای ڕاسەوە[1]
خوێتم گت نیەکێ وەکراسەوە

_ جوانان نەمرن خەیلی بمانن
ئەوەل هامسەرانە دەوران براِنن

_ شێرو بەچکە شێر ها لەدو واوە
وەتیر ئەیکن مەل وەحەواوە

_ دایە نەمردی یەقەوررۆ لە کنیا
ئیتر نێ مرد تائاخر دنیا

[1] ئەم بەیتانە لە ئافرەتێکی بە تەمەن لەدەوری (٦٠ _ ٧٠) ساڵ وەرگرتووە. بەناوی (فاتمە)خانەوە کە لەشاری خانەقین لەدایک بووە، نەخوێندەوارە.

ـ خۆزی خودای گەورەکاری بکردا
دایە لەجیاتی ڕۆڵە بمردا

ـ یاخود قەور هەڵکەنان هەر لە شتان ساق بوود
قەوری شەهیدان تاقو نیم تاق بوود

ـ قەوریان بکەنن ئەلهەد مرواری
جوان جوان دای بیران لاشەی بیماری

ـ جوانی بنێرن ئەڕا خۆشگەکانی
باڵە فاف بارن ئەڕا زامەگانی

ـ زامەگەی سەختە دەس بگری پێوە
ئەوا خوینەگەی بڕشێ لێوە

ـ موهلەتم نەوەی بامە شوینە گەد
دەم بخە وەناو قلپەی خوینە گەد

ـ دوگمە کەد بکەرەوە زامەگەد بوینم
دایە واز بادە خەڵتان خویتم

ـ ڕا دایگنو باوگی زوی بوەن خەوەر
خوینی ڕی کەدن وەک حەوز کەوسەر

ـ ئای خەمو دای خەم توو برامی
وە هەر جای مەچم ڕەفیقن ڕامی

ـ برا چەن خاسە ئەر هەزارێک بوو
سەر وەبێ برا مەینەت باری بوو

ـ بیلاوەی جورە دانیشم خەمگین
دەسەلاتمەو چەدیرم تەمکین

ـ جوانان وە بەرگ قەترانیەوە
مەیلیان ها وەلای جوانیەوە

ـ کافر نەکوشەی دوو دەس لە گیرفان
سەر حەساوی کەبا بادە مەیدان

ـ قوربان بالات بم دەس وە دوو دەسمال
لە تۆی خورشیدی خزمت دا شەمال

ـ پەردەی بۆ بکەن دووقاتو دوو لێو[1]
نەوا لێێ بدات گەماری نیوە ڕۆ

---

[1] ئەم بەیتانەم لە ئافرەتێک وەرگرتووە لە قەزای کەلار بەناوی (گوڵ ناز) خان کە تەمەنی (٥٤) ساڵە لە گوندی حاجی ابراهیم بەگ لە دایک بووە سەر بەقەزای خانەقینە، نەخوێندەوارە.

ـ پەردەی بۆ بەستن بکات وەرکان
تیا سەوز بین داری گردەکان

ـ حەیفە جوانان زوی مەون هلا ک
سەر وەبن وا دەنن لە گوشەی خاک
ـ خووزە وە ئەو ساڵە گافارە بویم
بێ خەم بێ خەیاڵ بێ پەژارە بویم

ـ دنیا هویچو پویچ کار وا شوارەک
برێ وە شادی برێ وە دل تەنگ

ـ دەردێ گرتمە نی یە دەرمانێ
یا حەق نەگرێگەی هیچ بسلمانێ

ـ دویەتی برادر دەماخی بەرزە
دویەتی بێ برا مردنی فەرزە

ـ رازی دلە گەم نەرویشم پەی سەنگ
سەنگ ستامەیوو مەگەردی لە رەنگ

ـ سزیامو برشیام بویم وەکوو بریان
بویم وەتماکو* سختەی سەر قلیان

* تماکو: توتن.

_ شەرت بوو لە داخ دا هەر پەحالم بوو
بەرگی ئازیەتی سال وەسال بوو

_ شەرت بوو لەداخد هەر گێر نەخەنم
بەرگی ئازیەتی لەوەر نەکەنم

_ شەرت بوو لە داخدا خوەم گیایی کەم
کەشکوڵ ئەل گرم ئاسیا پیاکەم

_ شەواری درێژ خەرقم کرد لەخەم
فەلەک تەویەم بوو منای کەس نەکەم

_ شوورە سواران ینین لە مەیدان
ڕووی ڕاو مەکەی لە جاگەی شێران

_ قەوری ئەل کەنن لەبان مەڕ مەڕ
واوە شینی کەن وە ڕەیحانی تەڕ

_ لەیەک برپاگە پای ڕێواریمان
وەیەک نیە ڕەسێ داو زاریمان

_ لوقمان بنیشێ ئەول ئەرەسوو[1]
هەر ئەوسا دەردم لایان دوای بوو

[1] ئەم بەیتانە لە ژنێک وەرگرتووە بەناوی (خەرامان نەورۆز) ئافرەتێکی (٤٥) سالە لەدێی (قامیشەلان) سەربە قەزای خانەقین لە دایک بووەو خوێندواری نی یە.

ـ کەسێ جووری خوەم ئاو نەنێ لەجوو
کەسێ جووری خوەم نەووگ ڕەنجەڕوو

ـمن کوڕی خەم بوِیم لەخەم بوِیم چیا
خەم ناوکم بڕی، خەم ناوم نیا

ـ منو بایەقوش هەردوو هاو دەردیم
کەلاوە نشین هەناسە سەردیم

ـ نەهەفتە گیر بوِیم نەچلە بردەم
ئەڕا خەم خواردن سەر گەورە کردم

ـ هەی داد هەی بێ داد لەگەڵ ملمەوە
خوشی ڕۆژگاران وە تەڵخ دامەوە

ـ هەر کەس خوەم دوینی تف لە چارەم کێگ
وە مسری ئاودار پارە پارەم کەیگ

ـ هەر کەس پەی مەردمن ویشێ مەکەی دای*
کەس نیەکەی دای پەی ڕەنج بەردی فەرهادی

* ئەم دوو دێرە بەشێوەی (گۆران) وتراوە، چونکە پێش ئەم سەردەمە زۆربەی دەوروبەری شاری خانەقین بەم شێوەیە قسەیان دەکرد بەلام شێوەی (لوڕی) شێوەیەکی سەرەکی یە کە دانیشتوانی خانەقینودەوروبەری بەم شێوەیە قسەدەکەن.

## شینو لاوانەوە بۆ کوڕی گەنجو لاو و شەهید بەشێوەی (لوڕی) :-

ڕوولە شەرت بوود لەداخەت هەر یەحالم بوود
بەرگ عازیەت داخت تێگەن سالو سالم بوود

چەن جەورو چەن جەفا چەن خاکە سەری
ڕوولە کرد بوەمو شوانەکەی حەق نەدیاری

ئەو مالە جوانەگەت برامبەرم بوود
چراخەت بووز ت سورمەی چاوم بوود

ئەو گولە زەردە سوو لەناو بڕی
نایدەی وەبان دلی ی ناهەی

ئەو قاتە جوانەگەت بخەرە بوخچە
وەختێ دەریکەم گولەیل کردیە خونچە

ڕوولە بیلگە نمەن وە داوانەوە
بوومەت و پیری ئیمامانەوە

ڕوولە چەکردی وەی بەهارەیە
خەمم دایدەر بان سەنگ غاریە

کوڕەگەم کەفتیە لەبان مەڕ مەڕ
خیرو مەندکی یە دەمی بکەت تەڕ

نەسوورت کردم نەدەزورانی
ئەی خوداوەندە ئەرا بردت نەفام و جوانی

وەی کێ بووم دەس وەزامەوە
کێ تیماری بکەتو دەرمانەوە

ئەی خواوەند لەسەر داخووری
بەین نازەو تا خوێن لەیەک داوری

سەربند گوڵکەم پایندە ڕەیحان
باوەشیند کەم وەڕەیحانەی تەڕ

نیمگەزی بالا سیگەزی گەردەن
لەویرم نلچت تا ڕۆژی مردن

ئەگەر نەمرم وە لۆمەی بان
کەپری ئەکەم شەو ڕۆژ لەلان

ئەو قەورسانە بکەمەی ماوە
لەتی دانیشم سپتا خوەراوا

تێمە قەورسان خاکی وەپاکەم
چاوە جوانەگەت لەتی پەیاکەم

ماڵە سیوریەگەت هیلمین وەپاوەم
بەچکە خوا کرد هاتیوە دیواوەم

ئەگەر دەربچێ داخەکەت لە دڵ
مەگەر ئوستای بێل وەشان بسپاردم لەگڵ

دەسم نەڕەس وەبرزی شاند
تاقەسم بخوم وە دیدەکاند

تویلە نمامی سەوزی لە باخمان
تیرەی لە لی نە خوادیم هەربی داخمان

ماڵە سیوریەک بەرام بەرم بوود
باچراکەی بسوزد سۆمای دیم بوود

داری نایە ڕیشەی لە شیشە
ئەی خودا هەڵی کەند لەبن ڕیشە

بیلا بتکی زویخ لە چاوەیلم
بیلا باوە خوار لەبان یەخەو داوانم

ها لە دریونم سەد زام خەتر
گشتی جا ژان کەد یەک لەیەک بەتر

ئەی خوا وە نە قاری پێم کردن
عاجزم لە گیان ڕازیم وەمردن

یا خوا خومینی ڕوژ مردند بوود
دەین دالگ شەهید لە گەردند بوود

دالگ خیز نەمگوژە تا بگرم سەنگەر
وەزب بردنەوە جەرگد بارمەدەر

لایلە ئەراد بکەم لای لەی شیرین
وەجاگەی چیت کەس کەس نەدیون

هازم ئەمایە بگیرم وەتاو
سەحراو سەرزەمین گشتی بکەمە ئاو

ئیمشو لە خەومەو دوکەوکێ مەقاقان
ئەوە لیلی بی مەجنون مەلاوان

هەر لیل لیل بی ئەوە تو نولیل
دەست لیلی بکەرێ لە باخچەی دووجیل

بیشەکێ نریاوید سەرینشکەی پیوە
وەختی هەلم دا ها ئیوە هەتیوە

لاشەو کەفتی وەکێ خەرمان گول
دەسو سەعاتە کە ناوید وەبان دل

یاخودا لەیلەکد شاری نەنیشێ
سیا داکەنی قرمز بپوشێ

ئەو قەوسانە ئاوا بیەوە
ئەی جوانی ئێمە نیشتە پێوە

تو مەچو مەچو تا برسم وەپید
باسی لەیلە جوان گەد پیوشی وەپید

مبارکد بود ئەو مال نووە
لایقد نی یە هەردارو مال چووە

بلا قەورەگەد لەسەری بود
بەژنەکەم بۆ سڵمان فاتیحای پێ بود

شێرمان کەفتیە شیرەوە بەتەوە
ناڵەی شیرە کەمان کەس نەی سەندەوە

کەلپل سیوریە گوینەمەی لە بوخچە
وەختی دەری کەم گولی بود قومچە

لەماڵ دەرچو بوینە عەجب سواری بید
وەختی هاتیەو تابوت باری بید

قەوری شەهیدان با لەسەر ڕێی بوود
بەلکەن بوڵمان یەکێ فاتحای بوود

هاتمە ئەو تورسانە هیچ نەدیمەوە
کزرو پەشیمان هەم هاتمەوە

لە مال دەرچیدە یا ئیمام ڕەزا
بایدە دیواوە سەر وەبێ قەزا

یادگاریەکد هاوەلامەوە
نەتۆ داوای کەی نەخزم دامەوە

بەوە مالەگەم شەو نەچوزەوە
تا لەخزمەتد بووم تا ڕوژ بوودەوە

ناوەگەد خۆشە، خۆش ناوی داری
لیواش گول تومچەی ئەول وەهاری

تولە دل مەگر داخی جوانی
وکەسی نەیانە ئاو زندانی

لیلی وە توریان قور مەجنون بای
تونیش وەک مەجنون هەسار شویتی بای

هەر بنشید یەتم لەشانی
وەک موم ئەسزیەد ئازای سوقانی

لەتو عەزیز تر مەگەر الله بێ
ئەویش لەبەر ئەو ئەوا گونابێ

ڕەفیقە گاند یەک یەک ژماردم
تو لەتی نیو هەم روح سوپاردم

مال شەهیدان قفلو کلیلە
لەیل لدانو سیاسە مانەو مەلویلە

کە لپەل عەسکری لەبردان تەنگە
لەهجوما بەجین زواندان لەنگە

ئەو دەشتەی بەسرە گشتی هەر قومە
سەرو بەیری یەی جندی لە تیاسەر گومە

خودا بکەی خومەینی ریەمردند بوو
دەین دایک شەهیدەگان لەملد بوو

خودا بکەی خومەینی دو کورت بمری
ثلح بکردای تا شهید نەمری

مەیلد هاوە لای کرسی سویرەوە
تەمەنای کردیە جوان لەدورەوە

وەفیدای ڕیشد بام نو دەرامان
پریەو نەکردید جەلاچی ئامان

ئیزرائیل گیانم نەسینە گیانم شرینە
وەچی گ چم کەسی مەد بوینە

کورد نابەتەی دەس کیشم کەران
لە ماڵەگەد دیل بویمە نیشانم دەران

خۆم خەمبارم بدیم خەم کردە بەرگم
خەم کردیە قولاو ڕیز سەرکردە جەرگم

ڕۆڵە بەخەف بلخەوت باتەوە
فریشتەی چاکان شەو وەدیاردەوە

وە بەرزی باڵاگەد دیتن کەوشد
شەماڵ مەشانو پاڵای پی خەوشد

شەرد بو لەداخدا دی ناز نەکەم
وە تەقەی قوندەرگەد نەمام قاپی واز نەکەم

ئەگەر ئەرا جەبهەچید تاوە تەماد نەوم
ئەگەر ئەرا نەجەف چید تاوە تەماد بوم

ئەی ماڵ نوو کوا خاوەنی
خاکەگەی نەجەف کردیە پاوەنی

ماسی لە دەریا گەنجو خەزینە
دی نیدوونم جوان وەی وینە

تو لە دل مەرگ داخ جوانی
وکەس نەیانە ئاو زندانی

لەوای ئیوارە مار لەچاگەمە
نەمار پەلامار نەفوەم راگەمە

کوچگ سەر بەڕە، گەرسان مەڕمەڕە
وە دیوەخان نیش خاترد جەمە

داخ گریانم پەی کوردە مالان
سەریان چی وە برمالیان وە تالان

بەد بەختی بەختم بەخشەوە مالم
خەتای تو نیە خوە بی چارەم

شەرد بوو لە داخد خوەم بکەمە دەوریش
مەگەر ڕا خوم بکەم لە تەومو خیش

---

گردی شەهیدان ئەلێ نی یە تاوانم
کوڕی شەهید بووە بە میوانم
یاخود تۆ نەمری تا سوبحی بەیان
بالی و کۆبنەوە قەومانو خزمان
قوربانی چەکی بانی شانتابم
ئەو ڕێگە ڕاستەی کوردستان بم

لای لایەتان بۆ ئەکەم بەوێنە کەوی
قەزای برسی و توینیەتی کەتان لە دایکتان کەوی
لای لایەتان بۆ ئەکەم لە ئێوارەوە
سەبەب کارتان بێ بە سێدارەوە
یاخوا بەرانان هەر پەستی نەت گرێ
کوڕی شەهید پیاتا سەر کەوێ
یاخوا بەرانان هەر لە زەوقلبێ
گوڵاڵە سورەی خاکی کوردان بێ
دەستم لێ مەدەن دەست لێ دراوم
لەبینی کوردستان شەهید کراوم
لای لایەت بۆ دەکەم بەدڵو بەگیان
یاخوا دوژمنان نەیەتە سەرتان
ڕۆژی دوو شەممە سەر لە ئێوارە
لەدوور سەیرم کرد تەرمێ دیارە
پرسیم ئەو تەرمە بۆچی بێ کەسە؟
جەماعەتەکەی تەنها شەش کەسە
وەڵامی دامەوە زۆر بەداخەوە
جەماعەتەکەم وا بە شاخەوە
دایە گیان ووتم ڕۆڵەی تۆ
هاتوومە کوڕێ، غەمگین دەست خەڕۆ
فرمێسکت بسڕە دایە چاوێک هەڵبێنە
بەرخی نێر دایە گیان بۆ سەر بڕینە
نەمامێکم ناشت بەڕووی کەندەوە
نەمامم هاتەبەر خوا لێ ی سەندمەوە
هەر چی کۆچ کۆچت بوو کۆچت کرد بە ڕاست
وەختی کۆچت کرد هیمەتت نەخواست

ئەو دبابەيەى لۆفەكەى برِى
كاكەى شەهيدم دەنگى هەڵبرِى
رِانك چۆغە سپى بىِو پوزە وانە
شانو دەمانجە لە خوتتان جوانە

---

قوربانى رِانكو چۆغەى سپيت بم — زاوا رِۆيە
كاكەى لادىَ سلاو بىَ ليتان — زاوا رِۆيە
كورِى سليمانى هاتوتە ناوتان — زاوا رِويە
لەرِامى خودا نان بدەن پيىان — زاوا رِۆيە
دايكى كۆل بە كۆل لە جيگەى گەرما — زاوا رِۆيە
كورِى دەر بەدەر وا لەناو بەفرە — زاوا رِۆيە

ياخوا نەكوژرِين بەسكى برسى — زاوا رِۆيە
لە دەورتان گەرِيم سميل قەيتانى — زاوا رِۆيە
جامانە بيەستىَ كورِى كوردانى — زاوا رِۆيە
زاوا رِۆيە هەر ئيمرِۆيە
لە پينم كراون كەلەپچەو پيوەند — زاوا رِۆيە
كاكەى كوژراوم پوزەوان لەپىَ — زاوا رِۆيە
رِجات لىَ ئەكەم دەستت نەلەرزىَ — زاوا رِۆيە

<u>هەروەها بەشيوەيەكى تريش ئەلاوينيتەوە:-</u>

بەم پايزە شيَر عەزيزە
نركەى نەوى كەوتە زەوى — واى واى وا وەيلىَ
بەم بەهارە شيَر مەهارە

هەی لاو هەی لاو
کوڕ زەردە لاو بردیان بەتاو
نایان لەچاڵ          وای وای وا وەیلێ

ناڵە ناڵ مەکە ناڵەت لە گیانم
تەزای ناڵەکەت بکەوێ لە ئێسقانم          وای وای وا وەیلێ
ماسی لە دەریا تیر لە غەزێتە
یاڵخوا کەس نەمرێ ئازیز بەوێتە          وای وای وا وەیلێ
ماسی لە دەریا دای لە شەقەی باڵ
دڵم بۆ دڵەکەت بوو بەکۆی زوحاڵ          وای وای وا وەیلێ
گەر سەرت دێشێ سەرکە سەڕانم
ناڵە ناڵەی برینکەت بکەوێ لە گیانم -وای وای وا وەیلێ
سەرتای بەهار بووە خەزان
چۆن هاتوو چرۆی هەڵوەران          وای وای وا وەیلێ
جارێ زوو بوو گەڵی زوو بوو
خۆ جەژن بەسەر نەچوو بوو
مەرگ تاوان پەلەی چی بوو*          وای وای  وا وەیلێ
دەک پیروزت بێ یانەی بەتەنیا
دیارە ڕوو سووری لەهەردوو دونیا          وای وای وا وەیلێ
یاڵخوا تۆ نەمری نەبی بەداخم
کۆڵەکەی ماڵم پەرژینە باخم          وای وای وا وەیلێ

---

* ئەم لاوانەوەی سەرەوە زیاتر بۆ کوڕێکی شەهید کراو ئەوترێ، ژنێک بەپێوە دەیڵێ‌و ژنانی تریش (وای وای وا وەیلێ) بەلاوانەوە دەڵێنەوە.

## لاوانەوە بۆ ئەوانەی لە دوورە ولات ئەمرن* :-

لە هەموو شوێنو سەردەمێکە دا لاوان بەهۆی بارودۆخی ئاڵۆزی ولات ناچار ئەبن بەهۆی باری تایبەتی خۆیان لە نیشتمانو کەسو کاریان دوور بکەونەوە، تووشی هەزارەها چەوسانەوەو دەربەدەری ئەبن هەر بەتەمای ئەو ڕۆژەن کە جارێکی تر بگەڕێنەوە نێو خاکو ئاوی خۆیان، بەڵام بەداخەوە زۆربەیان بەهیواو ئاواتی خۆیانو گەلەکەیان نەگەیشتوونو لەخاکی بێگانە مردوونو ئەو هەموو هیواو ئاواتەیان لەگەڵ خۆیاندا بردۆتە ژێر گڵەوە، وەگەلی کوردی ستەم دیدە گەلێ نمونەی لەم بارەوە وەک کەڵە پیاوی ناوداری لە دەست چووەوە لە خاکی بێگانە نێژراوە.

جا لاواندنەوەی لەم جۆرە زۆرە، کارەساتەکەش زۆر دڵ تەزێنو ئاڵۆزە، مردنی هەریەک لەو کەسانە دڵی هەموو مرۆڤێکی تێگەیشتوو داخورپێنێو کاری تێ ئەکات.

### بۆ نموونە :-

١_ جارکێش جارکێشێ: غەریبی مەردە
خەلق لەڕێ خودا کفنی کمردە

٢_ قەدر غەریبان بالەبان ڕێ بوو
بەشکم خەیرو مەن فاتیحای پێ بوو

٣_ من بوومە قوربان قات و قەمیسد
ئەڕا بیابان چی خودا حافیزد

* لە ( فهیمە مجید ) م وەرگرتووە، تەمەنی ٤٤ ساڵە، لە قەزای (خانەقین) لەدایک بووە، ژنی ماڵەو خوێندەواری نی یە.

٤_ دەلیلی هاتگە پێ نی یە زوان
دەلیل بەوە زوان دل بویە بریان

٥_ غەریبی شاران کاری پێم کەردەن
چەپ چەپ موی لەبان کەللم وا بەردەن

٦_ غەریبی شاران وەگوش ژنە فتم
قسمەت کاری کرد شەو تیاخەفتم

٧_ غەریب لە غوربەت ئەگەر وەشابوو
یاخود سەرکردەی تیپو سپابوو
سپای لەسپای نەوشیر نەود کەم
گووشەی دەروینی دایەم هاڵە خەم

٨_ چادری دیارە لەدوور تەم ئەکا
ئەوە کوڕمە برادەر جەم ئەکا*

٩_ جاڕ کێشاوە دەنگ زولاڵ
غەریبی مردووە کەس نەرچوو لەماڵ

غەریب غەریبە غەریبان کێ یە
غەریب لە شاران هەر چاوەڕێ یە

بێ تا بکەین دوو دەس لە گەردەن
ئەوا پیدا بێت لە ناکا مەردن

* مەبەست لەچادر دانان ئەوەیە کە لەگەرمیان زۆر باوە لە تەنیشت پرسەی ژنان چادری پیاوان هەڵ ئەواسن ئیتر پێویستیان بە مزگەوت نابێت ( ئەگەر هاتوو مزگەوتەکە دووربوو لە شوێنی ماڵەکە ).

مەکتوبی بنوسە لە پەڕەی پروشگە
ئەیە حاڵ من حاڵ تو چووینە

ئەو گوڵە زەردە سوو لە ناوری
نایدەی وەبان دڵی ی تاهی

شەر بوود لە داخد بچمەو کەنیـــە
شایتمان بارم و دەین عیسی

بەدبەختی بەختم بەخشە وە عالم
خەتایی تو نی یە خومم سی یە چارەم

شەر بوود لە داخت ترک دونیاکەم
کاشکول هەڵگرم مەولاو مەولا کەم

شەر بوو لە داخت بچم نامەوە
لە گوڵە زەردە وەها بامەوە

ولای کێ بووم دەست وە زامەوە
کێ تیماری بکەت و دەرمانەوە

من دوویرو تو دویر با بەینێ بوەسین
وعـــرەگەت چاو هەردووگمان سیروان هەڵوەسین

ئەی خەریبدە چەن و تەوەرە
شیلە لەشیلەی ئاگر بەتەرە

هەرکی نیشیگین غەریبی خاسە
ئەویش لە جومڵەی خودا نەناسە

غەریب غەریبە غەریب دیارە
دایەم ڕەنگی زەردو لێوی بەبارە

شەوان مەخەفم فکرم لە لادە
دڵی کوس کەفتی هەروە تەماتە*

**نمونەیەکی تر بۆ (غەریبی):-**

هەتارەکێ ومویارەکێ
ئەم سەفەرەت مویارەکێ
هەتارەکێ و چاوەکەم
بووکە لێ تۆراوەکەم
هەتارەکێ و واوەیلێ
باوانت شێوێ لەیلێ
هەتارەکێ و لەولاوە
بووکێ بگەڕیە دواوە
هەتارەکێ و نەورۆز بێ
بەرگی سپیت پیرۆز بێ
هەتارەکێ و لەزیزە
بووکەکەمان عەزیزە
هەتارەکێ و چاوانم
بووکێ لە جێ ی هەموانم

* لە زار (خاوەر خان برایم) تەمەنی٦٢ ساڵە، نەخوێندەوارە، بەهۆی کۆچی براکەیەوە کە لە دوورە وڵات کۆچی کردبوو بۆی وتین، ناوبراو خەڵکی شاری (خانەقین)ە.

## (ئەو سەردولکانەی تایبەتن بە پیاوانو ژنان)ەوە

**لە تازیەدا دەیلێن:**

١_ دیوە خانێ
٢- شانە شین
٣- لاوژە یان لاوژۆکە
٤- قەڵغان و شمشێر
٥- هێدی هێدی
٦- سەیدەم
٧- خۆشەن هاتەوە
٨- کەوەکەم دەوێ
٩- مەمکی نازداری

## شینی (دیوەخانێ)* ١-

دیوەخانی جۆرێکە لەم گریانە بەسۆزانە کە لە شینێ دەگوترێت، بۆ مردووی خاوەن دیوەخانو کوێخای گوندی یا هەر کەسێکی تری دیارو لێهاتوو و خاوەن قۆناغ برایە. شێوەی گوتنی ئەم دیوەخانانە بەم جۆرەیە ئافرەتێک بۆی دەکوتنو دووانی تریش دەیان گێرایەوەو بەیەکەوە لەسنگی خۆیان دەدا تاکو شلو کوت دەبوون یا ئەوەتە مەلای گوند یا پیاوێکی ماقوولو دیار و لێهاتوو یا مەلاژن یا هەر ئافرەتێکی تری بڕوادار برایە دەهاتو شینەکەیانی پێ بەردەدانو ئینجا ئافرەتەکان دەچوونە ژوورەوەو ماوەیەکی کەمی پێ دەچوو کۆمەڵە بانگ چی نوێ دەهاتنو بۆ جاری دووەم شینەکەیان دادەبەستایەوەو وەکوجاری پێشوش شینەکەیان بەردەدان و دەچوونە ژوورەوەو ئەمجارە لەجیاتی شین کردن ئاوازە دڵ تەزێنەکانی

* رۆشنبیری نوێ ژ. ١٠٣ - ١٠٤ ل٢٦١ -٢٦٣ ، ١٩٨٤

